# ژیاننامەی پێغەمبەری نازدارمان ﷺ

## سەردەمی مەککە (العهد المكي)

— بەرگی یەکەم —

دانراوی

د. مأمون فريز جرار    د. عمر سليمان محكل    الاستاذ. حسني أدهم جرار

گۆڕینی بۆ کوردی

انور قادر شێخانی




منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

هەولێر ٢٠١٤ ز - ١٤٣٥ ك

# ژياننامەی پێغەمبەری نازدارمان ﷺ

## سەردەمی مەککە ( العهد المكي )

## (بەرگی یەکەم)

دانراوی

د. مأمون فريز جرار    د. عمر سليمان محكل    الاستاذ. حسني أدهم جرار

گۆرینی بۆ کوردی

انور قادر شێخانی

**لیژنەی سەرپەرشتی دانانی ئەم پەڕاوە**



مؤسسة التأليف
جمعية الدراسات و البحوث الاسلامية
عمان - الاردن

# ژياننامەى پێغەمبەرى نازدار (صلى الله عليه وسلم)
## سەردەمى مەككە

دانراوى د.مأمون فريز جرار   د.عمر سليمان مكحل
الاستاذ حسنى ادهم جرار
دار المنهل/عمان أردن
گۆرينى بۆ كوردى :انور قادر شێخانى
ديزاين: نەريمان بهرام
هەولێر _ ٢٠١٤ز - ١٤٣٥ك     چاپى يەكەم

ژمارەى سپاردن لە كتێبخانەى گشتى(٢٤٨) سالى (٢٠١٤) پێدراوە

## پێشەکی دەقە عەرەبیەکە:

**الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ والصَّلاةُ والسَلامُ عَلَى سَيِّدنا مُحمدٍ وعلى الِهِ وصَحَبْهِ اجْمَعَينَ**

ئەم کتێبەی بەردەستان بریتی یە لەژیاننامەی پێغەمبەرلە سەردەمی مەککە وەباسێ لەژیانی پیغەمبەر دەکات لەکاتی لە دایک بوونی تاکو کۆچ کردنی لەمەککە بۆمەدینەی منەوەرە وەبریتی یە لەسی (۳۰) وانە لە هەر وانەیەک باسمان لە بابەتێ لەبابەتەکانی ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردوە بە شێوەی گفتوگۆ وشێوەی چیرۆکی سەردەمیانە وە هەوڵماندا بەشێوەی نوسینی ساناترین زمان وبەشێوەی وا کە قوتابیەکانمان لە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی خوێندن بێت بتوانێ سوودی لێوەرگرێ وە لەکۆتایی هەر وانەیەک کەمێک لێکدانەوەی ووشەی گران وقورسمان شیکردۆتەوە، وە لەگەڵ چەند سوودێک وزانیاریەک بەچەندەها هۆی فێرکردن وە لەکۆتایی هەروانەیەک کۆمەلێ پرسیارو وەڵاممان داناوە بۆ ئەوەی قوتابی بتوانێ لە پاش هەروانەیەک گفت وگۆی لەسەر بکات سوودی لێ ببینێت وە هەروەها ئەم پەرتوکە وەرگیراوە لە چەندەها سەرچاوەی باوەرپێکراو دوور لە هەڵە ولادان وە لەکۆتایی دا داواکارم لەخوای با لادەست ئەم کارو کردەوە وماندوبونەمان لێ وەرگرێ وە سوودێک بێت بۆ موسلمانان لەهەموو شوێنێکی ئەم سەر زەویە.

خوا پشت وپەنامان بێت

**دانــەران**

**پێشکەش بێت بە:**

١ - گیانی پاکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

٢- وە هەموو هاوەڵان وشوێن کەوتوان وزانایان وە خزمەت گوزارانی قورئان ودینی خوا.

٣ - پێشکەش بێت بە دایک وباوکم وخێزانم کە یارمەتی دەرم بوون.

٤- بۆ هەموو مامۆستاو ئەو هاوڕێیانەی یارمەتیان دام وڕێگایان بۆ ئاسان کردم بۆ سەرخستنی ئەم پرۆژە پیرۆزە بەتایبەتی کتێب خانەی مەحوی لە هەولێر خوا پایەداریان بکات.

٥- بەهەموو مرۆڤەکان کە بەراستی بە شوێن ڕێبازی بەختەوەری دا دەگەڕێن تا دەستیان کەوێ ولەسزای گۆڕ ودۆزەخ ڕزگاریان بێت.

# پێشەکی ئامادەکردنی بۆ کوردی

الحَمْدلِلهِ رَبّ الَعالَمِينَ والصَلاَةُ والسَلامُ على حبيبِ رَبّ العَالَمِينَ (مُحمدٌ) وعلى الِهِ وصَحبِهِ وَمَنْ تَبَعَهُ بِأحسانٍ الى يَوْمِ الدّين وبَعدَ:

براو خوشکانی بەرێزم لەسەر داوای زۆری برای بەرێزم ( کاک عبدالحکیم )خاوەنی پەرتووکخانەی مەحوی لە هەولێر هەڵ سام بە وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە کە لەدوو بەش پێک دێت بەشێکیان باس لە سەردەمی مەککە دەکات (العهد المکی) وە بەشەکەی تریان باس لە سەردەمی مەدینە دەکات (العهد المدنی) وە پاش خوێندنەوەی وام بە چاک زانی کە بۆ خوێنەوارانی گەلی کورد بیکەمە کوردی بۆ ئەوەی سوودی لێ وەرگرن وە کەلێنێک لەپەرتووکخانەی کوردی پڕ بکاتەوە، بۆیە لەسەفەری پڕ خێری سالی (٢٠١٢) بۆ حەجی مالی خودا لەگەڵ خۆم بردو لەوێ لە پەنای کەعبەی پیرۆز لەمزگەوتی حەڕام لەمەککەی پیرۆزو مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینە پیرۆز هەڵ سام بەدەست پێکردنی وەرگێرانی ئەم پەرتووکە نایابەوە کە لەبەرواری ٢٠١٢/١٠/٤ بوو وە داواکارم لەخوای بالادەست لێمی وەرگرێت وئەم نوسینەم دوور بکات لە ڕیاو ڕیابازی بە خالیص بۆ ئەو بێت و لەناو کردەوە پاکەکانم تۆماری بکات ومنیش و برای بەڕێزم کاک عبدالحکیم سەرکەوتوو بکات بۆ خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەشەرمەزاری بازاری قیامەت ئەبێت أمین

**انور قادر شێخانی**

**هەولێر**

**٢٠١٣/٢/٢٧ز بەرامبەر ١٧ ربیع الثانی ١٤٣٤ك**

وانەی یەکەم

# بارودۆخی عەرەب پێش ئیسلام



خالید لە قوتابخانە گەڕایەوەماڵەوە وسەرقاڵی ئەو شتە بوو کە لە مامۆستا گوێ بیست بوو دەربارەی بارودۆخی عەرەب لەسەردەمی پێش ئیسلامەتی دا کە مامۆستاکەی بۆی باس کردبوو کە ووتی عەرەبەکان لە دوورگەی عەرەب دەژیان. لەناوچەی ناوەڕاستی جیهان، وەشاری مەککەش ناوچەیەکی ئارام گربوو دوور لە دەستی ئیمپراتۆری رۆمەکان وفارسەکان بوو، وە داب ونەریتی عەرەبەکان ئەوەبوو کەعبەیان بە پیرۆز دەزانی کەوا باوکە گەورەمان ئیبراهیم وکورەکەی ئیسماعیل (علیهم السلام) دروستیان کردبوو، وە حەجی ماڵی خوایان دەکرد. وە لەگەل ئەوەش دا چواردەوری کەعبەیان پر کردبوو لەبت وسەنەم

پەرستی وەکو بتی هوبەل، ولات، وعوزا، وە عەرەبەکان لە چەند تیرەو هۆزێک پێک هاتبوون کە لە نێوانیان دا دوژمنداری، شەر وئاشوب هەبوو وە هیچ شتێ نەبوو بیان کات بە برایەتی وکۆیان بکاتەوە.

وە لەم کاتەدا خالید نوقمی گێژاوی بیرکردنەوە بوو لەم کاتەدا باوکی هاتە ژوورەوەو ووتی: کوری شیرینم بۆ دەت بینم مێشکت خەیال پلاوە وشلەژاوی؟

خالید: ووتەیەکم لەمامۆستای مێژوو بیست ئەمرۆ دەربارەی بارودۆخی عەرەبی پێش ئیسلام.

باوک: چ شتێک بیری وورووژاندووی ئەی کوری خۆم.

خالید: مامۆستا ووتی عەرەبەکان چەند هۆز وتیرەی دوژمنکاری هەبوو بوون لە نێوانیان دا، هەرتیرەیەک دەیویست بدا بەسەر ئەوەی تری دا پەلاماری یەکتریان دەدا وپیاوەکانیان دەکوشت وئافرەتەکانیان بەدیل دەگرت ومالّ وسامانی یەکتریان دەبرد وەشانازیان بەوە دەکرد، شیعر وهۆنراوەیان بەم شەڕانە دەگوتەوە وفەخریان پێوە دەکرد.

باوک: بەلێ ئەی کوری خۆم عەرەبەکانی پێش ئیسلام چەند تیرە وهۆزێک بوون لە هەموو دورگەی عەرەب بڵاوبوونەوە وئەوەی لە دەرەوەی دوورگەی عەرەب بوایە سەر بە رۆم وفارسەکان بوو.

خالید: مامۆستا بۆی باسکردووین دەربارەی هۆزی قورەیش ئەی هۆزەکانی تر چۆن بوون ئەی باوکە؟
باوک: هۆزەکانی عەرەب لەناوچەی دوورگەی عەرەب بلاوبوونەوە وە بارودۆخیان لە بارودۆخی عەرەبی قورەیشی چاکتر نەبوو دەربارەی پەرستن ولێک ترازان وجودایی وشەڕ لەنێوانیان دا.
خالید: بەڕاستی ئەوەی لەمامۆستام بیست زۆر کاری تێکردم دەربارەی هەندێک خورەوشتی عەرەب پێش ئیسلامەتی.
باوک: مامۆستاکەت چی ووت ئەی کوڕی خۆم؟
خالید: مامۆستا باسی ئەوەی دەکرد کەوا عەرەبەکان شەڕابیان دەخواردەوە و کچانی خۆیان بە بێ تاوانی زیندە بەچاڵ دەکرد وە قومارو ریبا وسودیان دەخوارد، بەڵام ئەمانە چۆن توانیان ببنە ئیسلام وببنە هەلگری پەیامی ئیسلام ئەی باوکی خۆم.
باوک: ئەی نابینی کوڕەکەم چۆن ئیسلام خورەوشتی ئەوانی پاراو کرد وپەروەردەی کردن بەجوانی وڕێک وپێکی ئیمانیان هێنا.
خالید: ئەی باوکە ئەی ئەوان کەمێک خورەوشت ومیوانداری یان هەبوو.
باوک: بەڵێ لە دیارترین ڕەوشتیان پێش ئیسلامەتی بەخشندە ودڵ فراوان وئازایی ونان دەربوون ویارمەتی بێ نەوایانیان دەدا ئەی کوری خۆم.
خالید: ئیسلام توانی عەرەبەکان بگۆرێ لە بت وسەنەم پەرستی وهاوەڵ دانان بۆ خوا بۆ خواپەرستی وبڕواهێنان بە خوای تاک

وتەنیا وبێ هاوەڵ وبێ شەریک، وە لە دوورە پەرێزی وجودایی بۆ یەک ریزی وبرایەتی.

باوک: بەڵێ وایە کوری خۆم وە کۆتایی ئەم ئوممەتە باشتر نابێ تەنها بەوەی کە سەرەتایی یەکەی پێ باشتر بووە.

## هەڵسەنگاندن

١ عەرەبەکان بەچی گورەپانی کەعبەیان پرکرد بوو لە پێش ئیسلام دا؟

٢ عەرەبەکان لە پێش ئیسلام دا چەند بتێکی گەورەیان دەپەرست، سێ لەم بتە گەورانە باس بکە؟

٣ ئەم بۆشایانەی خوارەوە بە ووشەی گونجاو پر بکەرەوە.

أ - دوورگەی عەرەب دەکەویتە ناوچەی ........وە مەککەی پیرۆز دوورە دەست بوو لە دەستی ئیمپراتۆری ..........

ب - عەرەبەکان پێش ئیسلام چەند خورەوشتێکی چاکیان هەبوو کە ئەوانیش بەخشندە و.........

٤ چەماوە بکێشە بە چوار دەوری وەڵامی راست لەمانەی خوارەوە:

أ - زمانی عەرەب پێش ئیسلام: بوو

فارسی رومانی عەرەبی

ب - ئەو پێغەمبەرەی کەعبەی بنیات نا

موسا بوو (علیه السلام) ئیبراهیم بوو (علیه السلام) عیسا بوو (علیه السلام

چالاکی

لەو کاتەی لە یەکەم وانەدا تەمەشای نەخشەکەت کرد وەلامی ئەمانە بدەوە.

أ . هەوڵ دە زانیاری دەربارەی سنوری دوورگەی عەرەب بزانە لەپاشان ناوی ئەو دەوڵەتانەی لە چواردەوری دوورگەکەدانە بنوسە.

ب . چەماوە بکێشە لەسەر ئەم هۆزانە لە نەخشەکەدا:

قورەیش، ئەوس، خەزرەج، سەقیف، مونازرە، غەساسینە

وانەی دووەم

# ڕەچەڵەکی پێغەمبەر و لەدایک بوونی (صلی الله علیه وسلم)




ڕۆژی دووشەمەی دوانزەی ڕەبیعی یەکەم یادی ڕۆژی لە دایک بوونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو خانەوادەی خالید دانیشتبوون لە دەوری باوکیان وەداوایان لێ کرد کەباوکی خالید بۆیان باسی چۆنیەتی لەدایک بوونی پێغەمبەری خوایان بۆبکات باوکیشیان وەڵامی دانەوە داوای لەکچی خۆی فاتیمە کرد وپێ ی ووت دەبێ تۆ باسی ڕەچەلەکی پێغەمبەرمان بۆ باس بکەی یەکەم جار.

فاتیمە: بەهەمووکەیف خۆشیەک ووتی ئەی باوکی بەڕێزم ئەوە پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم) کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیبە کوڕی هاشیمی کوڕی عەبدولمەنافە

باوک: زۆرجوانە کچی خۆم ، ئەی خالید ئایا ناوی دایکی دەزانی؟
خالید: بەڵێ باوکە: ئامینەی کچی وەهەبی کوڕی عەبدولمەنافە رەچەڵەکی لەگەل رەچەڵەکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەگەنەوەیەک لەگەل باپیری عەبدلمەناف
باوک: خوابەرەکەت بخاتە تەمەنتان کورەکانم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم ) گەورەی کوڕانی ئادەمە، ئیمامی موسلیم لە فەرموودەی صەحیحی خۆیدا دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: (خوای گەورە کینانەی هەڵبژارد لەنەوەی ئیسماعیل، وەهۆزی قورەیش هەڵبژارد لەنەوەی کینانە وەهاشمی هەڵبژارد لەقورەیش وەمنی هەڵبژارد لەنەوەی هاشیم)

## لەدایک بوونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

باوک: لە پاش ئەوەی ڕەچەلەکی پیرۆزی پێغەمبەرمان زانی (صلى الله عليه وسلم) ئێستا باسی چیرۆکی لە دایک بوونی دەکەین:

ئەبرەهە والی نەجاشی پاشای حەبەشە بوو لەسەر وولاتی یەمەن، وە ڕۆژێ لە ڕۆژان چاوی کەوت بە چەند کۆمەڵێ کەس لە عەرەبەکان کە بارگەیان تێک دەنا وخۆیان ئامادە دەکرد بۆ چوونیان بۆ مەککە وبۆ بە گەورەدانانی کەعبەی پیرۆز وبۆ حەج کردن وە ئەبرەهەش بەمە زۆر پەست بوو، وە کڵێسەیەکی گەورەی دروست کردناوی نا (قولەیس) لە پایتەختی یەمەن (صنعاً)، وەنامەی نووسی بۆ نەجاشی (من کڵێسایەکم بنیات ناوە وبۆ تۆ وە شتی وا دروست نەکراوە وە هەموو هێز وتەقەلام دەخەمە کار بۆ ئەوەی خەڵکان بۆ حەج کردن ڕووی تێ بکەن وە بەگەورەی بزانن وببێتە بەدیلێک بۆ کەعبەی شاری مەککە وە هەڵسا بە هاندانی عەرەبەکان بۆ ئەوەی بچن بۆ کڵێساکە و واز لە حەجیماڵی خوا بهێنن، وە لەم کاتە پیاوێ لە نەوەی کینانە بە مەی زانی شەوێ چووە ناو کڵێساکە ودارو دیوارەکەی بە پیسایی پیس کردو ناشیرینی کرد بۆ بەکەم دانانی ئەم کارەی ئەبرەهە، وە بۆ بەیانی ئەبرەهە زانی ئەم کارە کە ئەنجام دراوە لە لایەن پیاوێ لە عەرەبەکان بووە لەوانەی کەعبەی ماڵی خوایان بە گەورە داناوە، وە ئەبرەهە سوێندی خوارد کە دەبێ بچێتە مەککە وکەعبەی پیرۆز خاپور بکات وە بۆ ئەم کارەش نامەی بۆ نەجاشی نارد وئاگاداری کرد)

## ئەبرەهە سوپا ئامادە دەكات

ئەبرەهە سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد وەژمارەیەک فیلی لەگەڵ خۆی برد وە فیلێکی گەورەی لە پێشەوەی سوپاکەی دانابوو کە ناوی مەحمود بوو بەرەو شاری مەککە رۆیشت بۆ روخانی کەعبەی پیرۆز.

## لە ڕێگادا

کاتێ هۆزە عەرەبەکان گوێبیستی هاتنی سوپای ئەبرەهە بوون لە یەمەنەوە بۆ مەککەی پیرۆز وە هەندێکیان وویستیان بەرگری لە هاتنی سوپاکە بکەن وە نەهێڵن بگاتە شوێنی مەبەست بەڵام ئەویش شەری کرد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بەرگری دەکەن وە هەتا سوپا گەیشتە طائیف

وە لەم کاتەدا ئەی کورەکانم پیاوێ لە عەرەبەکان هاتە دەرەو وبەرەو رووی ئەبرەهە چوو چەند کەسێکی لەعەرەبەکان لەگەڵیاندا بوو لە هۆزی سەقیف پێیانی گووت:ئەی پادشا ئێمە چەند کەسانێکت بۆ دەنێرین لەگەڵتان دێین بۆ رێنیشاندەر بۆ گەیشتن بۆ شاری مەککە، لەپاشان ئەم عەرەبە پیاوێکی لەگەڵ ناردن کە ناوی ئەبو ریغال بوو بۆ رێنیشاندەری سوپای ئەبرەهە بۆ شاری مەککەی پیرۆز.

منداڵەکان: ئایا ئەمە ناپاکی (خیانەت) نەبوو بۆ ماڵی خوا ئەی باوکە ؟

باوکە: بەڵێ ئەی کورە خۆشەوستەکانم خوای گەورە تووشی مردنی کردن پێش ئەوەی بگەن بەماڵی خوا.

مناڵەکان: ئایا هەڵویستی گەورە گەورەکانی قورەیش چۆن بوو ئەی باوکە؟

باوک: گەورەی قورەیشیان عەبدولموتەلیبی باپیری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بڕیاری دا بە شەڕ نەکردن لەگەل سوپای ئەبرەهە وفەرمانی دا بە پیاوان وئافرەتان ومنالان کە دەرچن لە شاری مەککە بۆ چۆل وبیابان بۆ دەرباز بوون لە شەڕ وخراپەی ئەبرەهە، لەپاشان عەبدولموتەلیب چووە حەرەمی کەعبە ودەستی بە حەلقەی وقوڵپی کەعبە گرت وداوای لە خوا کرد کە کەعبەی ماڵی خۆی بپارێزێ وسوپای ئەبرەهە هەڵبگێرێتەوە نەتوانن بێنە ناو مەککە ودەستی ڕەشیان بگاتێ.

فاتیمە: ئایا خوا نزای عەبدولموتەلیبی گیرا کرد ئەی باوکە؟

باوک: بەڵێ ئەی کچی خۆم وە باس وخواسی ئەم چیرۆکە لەسورەتی فیل باس کراوە کێ دەتوانێ سورەتی فیل بۆمان بخوێنێ؟

خالید: من ئەی باوکە

باوک: فەرموو ئەی کوڕی خۆم

خالید:

باوک: ئافەرین ئەی خالید

فاتیمە: پرسیارمان لێ کردی دەربارەی چیرۆکی لەدایک بوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تۆش باسی سالی فیلت بۆ کردین ئەی باوکە، چ پەیوەندی هەیە لەنێوان ساڵی فیل ولەدایک بوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

باوک: لەم سالەدا ئەی کورەکانم پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە دایک بوو لەو کاتەی کە باوکی (عەبدوللا) ئامینەی دایکی خواست کەمێک پێش سالی فیل وە موحەممەدی کۆرپەڵە بوو لەسکی دایکی کە باوکی کۆچی دوایی کرد، وەپێغەمبەر بە هەتیوی لە دایک بوو لە رۆژی دوانزەی مانگی رەبیعی یەکەم لەساڵی فیل وەباپیری پەروەردە وبەخێوکردنی گرتە ئەستۆی خۆی وەناوی نا موحەممەد وە زۆری خۆش دەویست وە لەگەل خۆی دەنواند لەناو پێخەفەکەی دا.

**سوودێك**

رەچەلەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هاشیم کوڕی عەبدولمەناف کوڕی قوصەی کوڕی کیلاب کوڕی مورە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کوڕی غالیب کوڕی مالیک کوڕی فەهری کوڕی مالیک کوڕی نەزری کوڕی کینانەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مودرەکەی کوڕی ئیلیاس کوڕی موزەر کوڕی نیزار کوڕی مەعدی کوڕی عەدنانە.

وەزانایانی سیرەتناسان هاودەنگن لەسەر عەدنان کەلە منالانی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم (علیهما السلام)ە

## هەڵسەنگاندن

١. کێ رەچەڵەکی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بۆ باس دەکات؟

٢. رەچەڵەکی باوکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کوێ بە دایکی پێغەمبەر دەگاتەوە؟

٣. کێ بوو پەروەردە وبەخێوکردنی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) گرتە ئەستۆی خۆی پاش لەدایک بوونی پێغەمبەر؟

٤. ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە:

أ -ناوی باوکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .................... بوو وەناوی دایکی ....................

ب - پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەدایک بوو لەساڵی ....................

ج - ماڵی خوا بریتیە لە ........................

### چالاکی

لە سورەتی فیل پاش ئەودی کە گەڕای بە تەفسیری قورئاندا

أ - سوپای ئەبرەهە وفیلەکەی بەچی بەهیلاک چوون؟

ب - مانای ووشەی (سجيل، كعصف، مأكول) چی یە؟

### وانەی سێیەم

## شیر پێدانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وبەخێو کردنی



کاروانی دایان وشیرپێ دەرانی نەوەی سەعد بەرەو مەککە بەڕێ کەوتن بۆ مناڵ وەرگرتن وبە خێوکردنی، بەرامبەرکرێ یەک بۆبژێوی ژیانیان وبۆکرینی ئازوقەو جل وبەرگ هەروەکو عادەت وخورەوشتی عەرەبەکان وابوو منالّی خۆیان دەدابە دایان لەدەشت ودەروە بۆ پەروەردەکردن وفێربوونی زمان ڕەوانی و ئازایەتی چاونەترسیو سوارچاکی وەئەمەش لە سێیەکی کۆتایی رەبیعی یەکەمی سالی فیل کەوا سالێکی گرانی ووشکەسالی بوو بەهاری بێ گژوگیابوو.

وەلەگەڵ ئەم کاروانەدا ئافرتێک هەبوو کە ناوی حەلیمەی سەعدیە بوو کەوا سواری وولاغێکی لەڕو لاواز بوو وەمناڵێکی شیرەخۆرەی لەگەڵ دابوو کەهیچ وەختی گریانی رانەدەوەستا لە برسان، مێردەکەشی لەدوای دەرۆیشت کە ناوی حاریس بوو وە سواری وولاغێکی لە رولاوازبوو وەهەموو کاروانەکە بە پەلە گەیشتنە مەککە بەڵام حەلیمە ومێردەکەی دواکەوتن بەهۆی نەڕۆیشتنی وگوێ درێژ لەڕو لاوازەکەیان، وە پاش ماندوو بوونێکی زۆر گەیشتنە مەککەئەوجا حەلیمە هەستی بە حەسانەوە کرد.

## لە مەککەی پیرۆز

وە لەرۆژی دووەم دا هەموو دایانەکان لەشاری مەککەی پیرۆز بڵاوبوونەوە هەریەکێک سەری کرد بەماڵێک وداوای مناڵ بەخێوکردنیان کرد وە هەندەی پێ نەچوو کە هەموویان هاتنە نێو کەل وپەلی کاروانەکەیان وهەریەکێک لەم ئافرەتانە مناڵێکی وەرگرت ولەگەڵی دابوو، تەنها حەلیمە نەبێ ئەو گەرایەوە بێ مناڵ وە بەخەم وپەژارەیەکەوە، وە مناڵەکەی خۆی لەباوەش گرت مەمکی خۆی خستە نێو دەمی مناڵەکەی بۆ ئەوەی لەگریان بیوەستێنێ وە حەلیمەش نزیک بوو لەداخی خەم وخەفەت بتەقێتەوە بەڵام چی بکات ئایا دەبێ بەیانی یان دوو بەیانی بێ مناڵ لەگەڵ کاروانەکە بگەرێتەوە بۆ وولاتی خۆی، نەخێر تەنها مناڵێک مابوو کە ئەویش هەتیووو بێ باوک بوو وە ئەم مناڵەی وەرگرت وخستیە باوەشی خۆی لەکاتێکدا ئافرەتانی کاروانەکە رەخنەیان لێ گرت

ووتیان چۆن منالێکی بێ باوک وهەتیوت هێناوە وە ئەویش راوێژی بەمێردەکەی کرد وپێی ووت ئەم منالە وێنەی بەردەوام لەسەر چاوم دایە وە پێم ناخۆشە بگەڕێمەوە بێ منالێ شیرە خۆر وە مێردەکەی ووتی برۆ بیهێنە ولەوانەیە بەهۆی ئەم منالەوە خوای گەورە خێر وبێرمان بەسەر داببارێنێ، وە حەلیمەش بەرەو ماڵی ئەو منالە بەرێکەوت دەیویست ئەو منالە وەرگرێ وپێش ئەوەی بگەرێتەوە بۆ وولاتی خۆی.

**لەماڵی ئامینە**

حەلیمە خان بەرەو ماڵی ئەم منالە بە ڕێکەوت وداوای لەدایکی کرد کە ئەم منالەی پێ بدات وە ئامینەش داواکەی بەجێ هێنا ومنالەکەی دا بەحەلیمە لە پاشان حەلیمە ووتی ئەم منالە ناوی چی یە؟

ئامینەش ووتی: ناوی موحەممەدکوڕی عبدوللا، وباپیری عەبدولموتەلیب ئەم ناوەی لێ ناوە.

وە حەلیمە موحەممەدی (صلی الله علیە وسلم) بردە لای کاروانەکە لەم کاتە مەمکی خۆی بۆ دەرهێنا حەلیمە هەستی بەشتێ کرد کە لە سنگی جولایەوە لەپاشان هەستی کرد کە مەمکەکانی پڕ بوون لەشیر ئینجا شیری دایە منالەکە وتا تێربوو دوایی منالێ خۆیشی تێر شیر بوو.

**لەڕێگای گەڕانەوەی دا**

کاروانەکە کەوتنە ڕێگا بەرەو هۆزی بەنی سەعد بۆ وولاتی خۆیان وە حەلیمەش بەرێ کەوت ئەم گوێ درێژەی کەپێی هاتبوون نەی توانی بڕوات بەڕێوە وا ئێستاش هێزی هاتە بەر وە بەهێز بووە وە موحەممەدی لە پێش خۆی سواری وولاخەکەی کرد وە مێردەکەشی سواری ووشترەکەی بوو کە لەپێشدا زۆر لەڕوو لاواز بوو بەڵام وا هەردووکیان ئێستا بەهێز بوونە وە کەوتنە پێش کاروانەکەوە وە یەکێ لە کاروانەکە هاواری کرد ئەی حەلیمە ئەوە ئەو وولاخە نەبوو کە لەپێشدا لەدواین کاروان بووی لەسەرەتادا هاتی بۆ مەککە ئەوە بۆ ئێستا لەپێشەوەی کاروانەکە دای، ئەویش لە وەڵامدا ووتی ئەرێ وەڵلا ئەمە وولاخەکەی جارانە.

وە حەلیمەش گەیشتە نێو هۆزی بەنی سەعد کە لە پێشدا ووشک وشکە سالی بوو وا ئێستا لەوەرگای ئاژەڵانی حەلیمە بەسکی تێر دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە بۆ هۆی موحەممەدە وە خێرو خۆشی رووی لە هەوارەکەی حەلیمە کرد.

**گەڕانەوە بۆ مەککە**

دیسان کاروانەکەی دایان و شیر پێ دەران رووی یان لە مەککەکردەوە بۆ هێنانەوەی منداڵەکان بۆلای کەس کاریان و حەلیمەش هەستی بەخێرو بێرێکی زۆر کرد ماوەی ئەم دوو ساڵەی داو ئەم دوو ساڵە زۆربەزووی ڕۆیشت چونکە دەرگای خۆشی وهەرزانی ی بۆی کرایەوە لەوکاتەی موحەممەی بردەلای خۆی وە حەلیمەش لە دڵی خۆی دادەیگوت چۆن وابکەم دایکی ئەم منداڵە رازی بکەم ئەم منداڵەم پێ بدات دووبارە لەگەڵ خۆم بیبەم بۆلای خۆمان

حەلیمەخان فەرمووی: ئامینە ئەگەر رازی بی موحەممەد تاماوەیەکی ترلامان بێت چونکە لەونەخۆشیەی دەترسم کە لە مەککە پەیدابووە نەبادا تووشی بێت وەئامینەش وەلامی دایەوە وەحەلیمەش موحەممەدی گرتەوە باوشی خۆی وبردیەوە بۆ لادێکەیان وەخۆشی وشادی گەڕایەوە سەر لێوی ئەم خانەوادەیە وەموحەممەدیش لەوێ مایەوە تاکو دووساڵی تر وەلەگەڵ برا شیریەکەی دەچووە دەشت ودەر بۆ ئاژەڵ لەوەڕاندن وە پەوەردەو گۆش کرا لەلادێ وبیابان وفێری زمانی پاراوی عەرەبی بووکە هۆزی بەنی سەعد وبەنی بەکر بەناو بانگ بوون پێیەوە

روداوی سنگ لەت بوون

روداوێک ئەم جارەیان رووی داکەوا کەس هەستی پێ نەدەکرد حەلیمەخان فەرمووی سوێندم بەخوا چەند مانگێک پاش هێنانەوەی موحەممەد

بۆماڵەکەمان، موحەممەدو برا شیریەکەی مەڕ وئاژەڵیان دەلەوەڕاند لە نزیک ماڵەکەمان لەم کاتەدا براکەی بە هەڵەداوی بەخێرایی ڕای کرد بۆ لامان ووتی بەمن وباوکی ئا ئەوە موحەممەدی برام، دووپیاو هاتنەلای بەرگیان سپی بوو رایان خست بەزەویدا سنگیان لەت کرد شتێکیان لەسنگی دەرهێناو نازانم چی بوو. وە لەم کاتەدا من ومێردەکەم رامان کرد وچووینەلای وبینیمان راوەستابوو رەنگی گۆڕابوو ئێمەش موحەممەدمان لە باوەش گرت ووتمان چی بوو ئەی کوڕی خۆمان ئەویش چی دیبووی بۆی باس کردین، وەحەلیمەش فەرمووی موحەممەدمان هێناوە بۆماڵەوە وحەلیمە ترسا موحەممەد تووشی شتێ هاتبێ.

مێردی حەلیمە کە ناوی حاریس بوو ووتی ئەی حەلیمە من لەوە دەترسم

تووشی شتێکی ناخۆش بێت حەزدەکەم بیبەینەوەلای دایکی پێش ئەوەی تووشی شتێک بێت.

**گێرانەوەی بۆلای دایکی:**

ژن ومێرد بریاریان دا بەگێرانەوەی موحەممەد بۆ لای دایکی

ئامینە فەرمووی لەوکاتەی کە منالەکەی گرتە باوەشی: ئەی حەلیمە تۆ لەسەرەتادا بە ئومێدی ئەوەبووی موحەممەد هەرلای تۆ بێت بۆ وازوو هێناتەوە

حەلیمە: ئەو ماوەیەی کە دامنابوو بۆ بەخێوکردن کۆتایی هات وترسام کە تووشی شتێک بێت بۆیە هێنامەوە لای تۆ.

ئامینە: ئەوە خوورەوشتی تۆ نەبوو قسەم بۆ بکە؟

حەلیمە: ئێمە کە هێنامانەوە پێمان خۆش نەبوو بەلام .....

ئامینە: هەناسەی ساردی هەلکێشا وتەماشای حەلیمەی کردو....لەپاشان ووتی ئایا لە ترسی شەیتان لێی ترسای ئەی حەلیمە

حەلیمە:بەلێ

ئامینە: نەخێر، سوێندم بەخوا هیچ رێگایەک نی یە شەیتان پی بگاتە ئەم کورەم وئازاری بدات، بەس پێم بلێ چی رووی داوە

حەلیمە: بەلێ ، حەلیمەش ئەوەی دیبووی بە ئامینەی دایکی راگەیاند ولەورۆژەی کە بردیەوە مالەوە وتاکو ئەو رۆژەی کە هێنایەوە لە پاشان ئامینە قسەی بەحەلیمە بری وفەرمووی: برۆنەوە بۆ مالی خۆتان بەسەلامەتی واز لەم کورەم بهێنن

هەڵسەنگاندن

١- کێ بوو ناوی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نا موحەممەد؟

٢- دایان وشیر پێدان عادەت ورەوشتی منالانی دەوڵەمەند بوو هۆی چی بوو؟

٣- ئەم بۆشایانەی خوارەوە بە ووشەی گونجاو پڕ بکەرەوە

أ- دایانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ........بوو

ب - کاروانی دایان وشیر پێ دەران گەرانەوە بۆ هۆزی بەنی سەعد وە حەلیمەش سواری وولاخەکەی بوو وە مێردەکەشی سواری ووشترەکەی بوو لە پێش دا دواهەمین کاروانی ........... بوون

ج- حەلیمە سوربوو لەسەر هێشتنەوەی وموحەممەد لای خۆی ماوەیەکی زیاتر بەڵام لە پاش دیتنی .............

٤- نیشانەی (✔) بەرامبەر وەلامی راست ونیشانەی (✘) چەوت بەرامبەر وەلامی چەوت دابنێ

أ - وولاخی حەلیمە دواکەوت لەکاروانەکە لەکاتی چوونیان بۆ مەککە بەهۆی لەڕو لاوازی وولاخەکەیان.

ب- پێشبرکێ ئافرەتان بۆ سەر موحەممەد لەبەر ئەوەی منال وهەتیو بوو.

ج- خانەوادەکانی بەنی سەعد بریتی بوون لەزەوی وشک وبێ بارانی وە لەپاش هێنانی موحەممەد بووبە زەوی پاراو گژوگیا

د - پاش رووداوی سنگ لەت بوونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حەلیمە زیاتر هۆگری موحەممەد بوو حەزی نەکرد لێی دوور کەوێتەوە.

وانەی چواردەم

## هەتیوو کەوتنی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)



موحەممەد لە باوەشی دایکیا ژیا تاکو تەمەنی گەیشتە شەش ساڵان، وە دایکی بەسۆزەوە بەخێو پەروەردەی دەکرد وە باپیریشی لەجێگای باوکی عەبدوڵڵای حیساب دەکرد کە ئەو لە سکی دایکیا بوو کە باوکی کۆچی کردبوو لە مەدینە ولەوێش نێژرا.

ئامینە هەستی کرد وحەزی کرد کە سەردانی گۆڕی عەبدوللای میردە خۆشەویستەکەی بکات وموحەممەدیش لەگەل خۆیا ببات بۆ مەدینەی منەوەرە.
بەم هۆیەوە ئامینە هەستا دوو ووڵاخی ئامادەکرد بۆ ئەم سەفەرە وە کوڕە تاقانە خۆشەویستەکەی لەگەل خۆی ببات پاش ڕەزامەندی وەرگرتن لە باپیری عەبدولموتەلیب.

**لەیەسرب(مەدینە):**

ئامینە خان مانگێکی تەواو لای ماڵی خاڵوانی موحەممەد مایەوە لە شاری مەدینە وەلەگەل موحەممەد دا سەردانی گۆڕی عەبدوللایان کرد وە موحەممەدیش لەوێ لەگەل منالانی نەوەی نەجاری خالوانی گەمەو گالتەی دەکرد.

**گەڕانەوە بۆ مەککە:**

وە لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ مەککە ئامینەی دایکی موحەممەد (صلی الله علیە وسلم) هەستی بەئازارێک کرد لە لای چەپی لاشەی وە لە ناوچەیەک دا کە پێی دەڵێن ( ئەبوا ) نەخۆشیەکەی زۆری بۆ هێنا وگیانی پاکی سپارد لەوێ دا وە لەم کاتەدا کوڕەپەی ساوای جێهێشت وە موحەممەد لەگەڵ کەنیزەکی دایکی کە حەبەشی بوو ناوی (البرکە) بوو گەڕانەوە بۆ شاری مەککە بە خەمگینی وە عەبدولموتەلیبی باپیری پێشوازی لێ کردن، وە زۆری خۆش دەویست وە لەمەجلیسی خۆی دادەنا ولەخۆی نزیک دەکردەوە ولەتەک خۆیا دای دەنا وە لەم کاتەی موحەممەد تەمەنی

بوو بەهەشت سالان باپیریشی کۆچی کرد ولەپێش دا وەسیەتی بە مامی کرد ئەبو طالیب کە ئەو بەخێوی بکات وچاودێری بکات ئەبو طالیبی مامی پیاوێکی کەم دەرامەت وهەژار بوو بەڵام لەوکاتەی موحەممەدی گرتە باوەشی خۆی، خوا دەرووی خێری لێ کردەوە وپیت وبەرەکەتی بەسەر دا رژاند وە کاتێ موحەممەد لە مالی ئەبو طالیب بوو وە رازی بوو بەو بەشەی خوا پێی داوە وە هەلسوکەوتی وەکو منالی تر نەبوو کاتێ خواردن ئامادە دەبوو هەڵپەی نەدەکرد بۆ نان خواردن وپەلە پەل کردن بەهێمنی ولەسەرخۆی دادەنیشت.

وەموحەممەد ژیالەگەل مامی ئەبو طالیب خوا پارێزراوی کرد بەچاودێری خۆی دووری خست لەو بیرو بۆچونانەی لارێ بوون لەنەفامی دا وە مامی، موحەممەدی زۆر خۆش دەویست هەتا ئەگەر لێیان پرسیبایە ئەم کورە هی کێیە دەی ووت کوری خۆمە، وە کاتێ سەفەری کرد بۆ شام بۆ بازرگانی موحەممەدی لەگەڵ خۆی برد.

وە سەفەریشی لە مەککەوە بەرەو شام زۆر بەئازار وناخۆشی بوو وە رێگا دوور بوو وە ئەو فێری بەرگری کردن لەسەفەر وناخۆشی بوو بوو هەر لە منالیەوە کە لەگەل حەلیمەی سەعدیەی دایانی، وسەفەرکردن لەگەل دایکیا بۆشاری مەدینەی پیرۆز، وهێستا ئەوە بەرگەی ناخۆشی رێگای دوور دەگرێت لەگەل ئەوەش سەفەرەکەش لە گەرمە هاوین دابوو چونکە قورەیشیان عادەتیان وابوو هاوینان دەچوون بۆ شام وزستانان دەچوون بۆیەمەن، وە کاروان بەرێگادا دەرۆیشت ئەگەر گەرما زۆری بۆ هێنابان ئیسراحەتیان دەکرد لە فێنکی ئێواران بەرێ دەکەوتن هەتا گەیشتن بە گوندێک لە گوندەکانی شام کە پێی دەلێن (بوسرا)ی شام.

**له بوسرا:**

راهیبێک که ناوی بوحه‌یرا بوو له‌بوسرا له موحه‌ممه‌دی رووانی بیری لێ کرده‌وه وله‌پاشان رووی له ئه‌بوطالیبی مامی کردو ووتی: ئه‌م مناڵه چی تۆ ده‌بێت؟

ئه‌بو ئه‌بوطالیب ووتی: کوڕی خۆمه

بوحه‌یرا: ئه‌مه کوری تۆ نیه ونابێ باوکی زیندوو بێ.

ئه‌بوطالیب:ئه‌مه برازامه

بوحه‌یرا: باوکی له کوێوه‌یه

ئه‌بوطالیب: پێش له‌دایک بوونی باوکی مردووه

بوحه‌یرا: راست ده‌که‌یت، بگه‌ڕێوه بۆ وولاتی خۆت پارێزراوی بکه، ئه‌م کوڕه له ده‌ست جوله‌که‌کان، ئه‌گه‌ر ببیینن ئێستا لێره به سه‌لامه‌تی ناگه‌رێته‌وه، چونکه ئه‌م کوڕی براته پاشه رۆژێکی گه‌وره‌ی هه‌یه، وه ئه‌بوطالیبیش به په‌له موحه‌ممه‌دی هێناوه بۆ مه‌ککه.

## هەڵسەنگاندن

١) ئەم بۆشاییەی خوارەوە پڕ بکەوە

باوکی موحەممەد کۆچی دوایی کرد ئەو لە سکی دایکیا بوو وە دایکی کۆچی دوایی کرد ئەو تەمەنی ........... ساڵان بوو وە پاپیری کۆچی دوایی کرد موحەممەد تەمەنی ............ ساڵان بوو.

٢) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەناعەتی بەو بەشەی خوا پێی داوە هەبوو باسی رووداوێک بکە بەڵگە بێت لەسەر قەناعەتی ئەو (صلی الله علیه وسلم)

٣) چەماوە بکێشە بەدەوری وەلامی راست لەمانەی خوارەوە

أ - پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) راهاتبوو لەسەر سەفەر کردن وە سەفەری کرد بۆ

○ نەجد ○ مەدینە ○ یەمەن

ب - ناوی ئەو راهیبەی موحەممەدی بینی وناسی، چی بوو

○ عەدداس ○ بوحەیرا ○ ئەسطاس

٤) وەلامی ڕاست هەلبژێرە بە ووشەی گونجاو

أ - ئەبوطالیب کە پرسیاریان دەربارەی موحەممەد لێ بکردبایە دەیفەرموو: ئەوە

○ برازامە ○ کوڕمە ○ نەوەمە

ب - راهیبەکە بە ئەبوطالیب ووت بگەرێوە بۆ وڵاتی خۆت موحەممەد بپارێزە لە

○ ئەنصاریەکان ○ ئاگر پەرستان ○ جولەکەکان

ج - موحەممەد سەردانی گۆڕی باوکی کرد لە مەدینە ومیوانی ماڵی خالوانی بوو لە نەوەی:

○ عەوف ○ سەعد ○ نەجار

## وانەی پێنجەم

**کارو کاسبی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە منالیەوە چاودێری خوا بۆی**



**کارەکانی (صلی الله علیه وسلم):**

مامۆستا ووتی: لە خورەوشتی عەرەبەکان وابوو کە منالەکانیان لە بچوکی دا فێری شوانی ئاژەلان دەکرد بۆ ئەوەی فێری کارو کاسبی ویارمەتی دەری باوکی بێت وە ببیتە مەشق وراهێنان هەتا ئەو کاتەی گەنج دەبێت تووشی چەرمەسەری ودەست وپێ سپی نەبێت وە پێغەمبەریش لە منالیەوە لە ژێر چاودێری وبەخێوکردنی مامی دابوو وە هەستی بە بار قورسی مامی دەکرد چونکە مامی خاوەن کۆمەڵێ منال وخاوخێزان بوو بۆیە هەڵسا بە شوانی ئاژەلان بۆیارمەتی دەری مامی وە مەڕی بۆ خەلکی

مەککە دەلەوەڕاند لە بەرامبەر خواردەمەنی بۆ ئەوەی بەئارەقی نێوچەوانی نان بخوات وچاوی لە دەستی کەس نەبێت وە ببێتە بار سوکی بۆ مامی وە کە موحەممەد گەورەبوو گەنج بوو دەستی دایە بازرگانی، وە لەم کاتە کە خەدیجەی کچی خوەیلید زانی موحەممەد فێری بازرگانی بووە وزۆر دەست پاک وئەمینە ولێهاتووە موحەممەدی بەکرێ گرت کە کاسبی وبازرگانی بۆ بکات لە مەککە بۆ شام وە موحەممەدیش (صلی الله علیه وسلم) رازی بوو وە ئەویش کرێی زیاد لە کرێی خەلکی تری پێدا، وە چوو بۆ بازرگانی بۆ شام وە لە گەڕانەوەی دا بە قاازانجێکی زۆرەوە گەرایەوە مەککە وە هەر ئەم خوورەوشتە ودەست پاکی ئەو بوو کە بووە هۆی مێرد پێ کردنی خەدیجە بەو.

**چاودێری خوای گەورە بۆ پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):**

چاودێری خودا بۆموحەممەد دیاردەیەک بوو هەر لەو کاتەی کە لە سکی دایکیا بوو لە دایک بوو وە لەوکاتەی کە باپیری ومامی بەخێویان دەکرد وە هەر لە کاتی ئەوانیش کوچیان کرد هەر لەژێر چاودێری خوادابوو.

وه خوای گەورە ئەم چاودێریەی موحەممەدمان بۆ باس دەکات لە سورەتی (الضحی) کە دەفەرموێ:

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

﴿ وَالضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾

واتە: سوێند بە چێشتەنگاو وە سوێند بە شەو کاتێک بە تاریکەکەی زەوی دادەپۆشێت . پەروەردگارت دەستبەرداری تۆ نەبوە وازی لە تۆ نەهێناوە خەشمی لێ نەگرتوویت . بێگوومان قیامەت ودوارۆژ چاکترە بۆ تۆ لە دونیا . لە ئایندەدا پەروەردگارت ئەوەندە نازو نیعمەتت پێدەبەخشێت کە زۆر پێی رازی وخۆشنود دەبی . ئایا پەروەردگارت نەی بینیوی کە بەهەتیوی، وخێرا دەرووی لێ کردویەتەوە وە لانەی بۆ سازاندیت وحەواندیتیەوە . ئەی سەرگەردان نەبویت نەت ئەزانی چی بکەیت، هیدایەتی دایت ورێنمونی کردیت وە ئەی نەی بینی کە هەژار بوویت وسامانی پێ بەخشیووی ودەولەمەندی کردویت . **تەفسیری ئاسان ل٥٩٦**

بەڵێ ئەی کوڕەکانم: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هەتیوو بوو باپیری گرتیە باوەشی خۆی وبەخێوی کرد وە خوا دایانێکی چاکی بۆ رەخساند کە لە رابردوو باسمان کردوە دایکی کۆچی کرد مامی گرتیە باوەشی وسەرو کاری دەکرد وە خوا ئاوڕی لێ دایەوە بەهۆی شوانی مەڕەکانی خەڵکی مەککە دوابەدوای

بازرگانی دەکرد وە دوایی خوای گەورە رێی نیشان داو کردی بە رەحمەت وهیدایەت بۆ جیهان وە پاراستی لەدەست کافرانی مەککە وفێڵ وتەلەکەیان وە دوای ئەو کۆچی کرد بۆ مەدینە وە خوا رێزی لی گرت ومەککەی لەسەر دەستی ئەو دا فەتح کرد ودوایی دوورگەی عەرەب سەرتاپای کەوتە ژێر چەنگی ودەسەلاتی خۆی (صلی الله علیه وسلم) وە لە دیاردە روونەکانی پاراستنی خوا بۆی ئەوە بوو، ئەی کورەکانم رۆژێک مەڕی بۆ خەلکی دەلەوەڕاند گوێی لەدەنگی دەهۆڵا وگۆرانی بوو وە ویستی بچێ بۆی وەکو گەنجان بەلام خوای گەورە خەوی بەسەر چاوی داباراند و خەوی لی کەوت وە ئەمە جارێکی تر دوبارە بویەوە وە خوای گەورە هەم دیسان پاراستی هەتا کاتێ بوو بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وە گەمە وياری نەدەکرد وەکو منالانی سەردەمی خۆی وە لەژیانی دا مەی خواردنەوە وپەرستنی بتی لەسەر خۆی حەرام کردبوو وە خوا ئامادەی کرد بۆ هەلگرتنی پەیامی خۆی.

## هەڵسەنگاندن

١ لە سورەتی (الضحی) ئەو بەڵگەیە دەربێنە کە نیشانی دەدات **خوا** چاودێری دەکات.

٢ یەک ڕووداو باس بکە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تووشی هات کە خوای گەورە پاراستی لە عادەت وخورەوشتی نەفامی.

٣ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە.

أ - پێغەمبەر بە هەتیوی لـــە دایک بوو بـاپیری بەخێوی کرد کە نـــاوی ..................

ب - لەو کاتەی موحەممەد دایکی مرد ومامی بەخێوی کرد کە ناوی .................. بوو

ج - لەوکاتەی موحەممەد دیتی ئەبو طالیبی مامی خاوەن خێزان وماڵ ومناڵ بوو وویستی کارێک بکات تاکو

١ - ..................................................................................

٢ - ..................................................................................

د - لە خورەوشتی عەرەبەکان ئەوەبوو مناڵیان فێری ئیش دەکرد تاوەکو ..................................................

ە - موحەممەد لە مناڵیەوە ئیشی دەکرد لەژێر چاودێری .................................. وە کە گەورە بوو کاری بۆ .............................. دەکرد.

## پەیمانی (حلف) الفضول



لەوانەی رابردوو زانیت کە عەرەبەکان پێش ئیسلامەتی چەندخورەو شتێکی باشیان هەبوو لەوانە بەخشندەیی و ئازایەتی وجگەلە هی تریش وە لە نێو شاری مەککەش چەندها پیاوی بلیمەت وخاوەن ئازایەتی جوامێری یان هەبوو کەوا نە ستەمی دەکرد وەنەلەوانە حەزی لە ستەم بوووە بەرەنگاری ستەمی دەکرد وە ئەم جۆرە پیاوانە پەیمانیان لەگەل یەکدی بەست کە ئەم پەیمانەش ناونرا (حلف الفضول) بەلام جۆری ناونرانی ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێ لە ناوچەی زوبەیدە بوولە یەمەن هاتە مەککەی پیرۆز کەلو پەلی هیناوە یەکێک لە قورەیشیان کەلوپەلی لێ کڕی کە ناوی عاصی کوری وائیل بوو بەلام شتیکی لێ سەند و پارەکەیی

پێ نەداوە کە ئەویش داوایی مافی خۆیی کرد عاصیش خزمەتکارەکانی خۆی تێگەیاند کە لێی بدەن وجوێنی پێ بدەن، وە کابراش شکایەتی حالی خۆی لەلای پیاوە ئازایەکان و بلیمەتەکانی قورەیش کردولە نەوەی هاشیم ونەوەیی زوهرە وە ئەوانیش لەماڵێک کۆبونەوە خواردنیان بۆ دروستکردو بڕیاریان دا کەپەیمانێک ببەستن و سوێند بخۆن بە خوا هەموویان یەک دەست بن بۆ نەهێشتنی زۆرداری وستەم هە تاکو ماف بۆ کابرادەسێنی وەنابێت لە شاری مەککە کەسێ ستەمی لێ بکرێ دەبێ دەست بەجێ سەری بخەن وەبە هۆی ئەمەوە ئەم پەیمانە ناونرا بە (حلف الفضول)

**سەرخستنی ستەم لێکراو :**

ئەم کۆمەڵە پیاوانە لەگەڵ برای ستەم لێکراو چوون بۆ لای عاصیی کوری وائیل وە توانیان مافی ستەم لێکراو بسەنن، وە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) ئامادەیی ئەم پەیمانە بووە کە پێش هاتنی وەحی بوو بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەکە تەمەنی پیرۆزی بیست ساڵ بوو هاوبەشی کرد وەکە ناردرا بۆ پێغەمبەرێتی زۆر مەدح وسەنای ئەم پەیمانەی دەکرد چونکە لە کردەوە چاکەکانی ئیسلام وە، پاڵپشتی دەکات وەکەسێ هەڵسێ بەم کارە پاداشت دەکرێتەوە کە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ :خۆم ئامادەی بووم لە ماڵی عبدوللای کوری جودعان ئەم پەیمانە کە لەمێگەڵی حوشتری سوور بۆ من خۆشەویسترە وە ئەگەر بانگ بکرێم لەوەبۆ ئیسلام بۆی دەچم چونکە پێغەمبەر ناردرا بۆخورەوشتی جوان وە ئەو پەیمانەش خورەوشت بوو.

ئیسلام ئەی کورەکانم ستەمی قەدەغە ویاساغ کردوە وەقەدەغەی کردوە کەسێ یارمەتی ستەم کاربدات وە ئیسلام رادەوەستێ لەلای ستەم لێکراو هەروەکو ئیسلام رێی داوە پەیمان وپەیوەندی لەسەرکاریی چاک کە خوای گەورە دەفەرموێ: ( وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ) المائده: ٢

واتە: یارمەتی و کومەکی یەکتر بکەن لەسەر چاکەو خواناسی، نەکەن یارمەتیو کۆمەکی یەکتربکەن لەسەرگوناەو دەست درێژی (تەفسیری ئاسان:( ١٠٦)

### شایادژانی:

الحلف: کۆبونەوەیی کۆمەڵێ پیاوی ئازا بۆ پەیمان بەستن لەسەر کردەوەیەک

الفضول: ماڵ وسامان یان ماندوبونێکی لە رادەبەدەرە لە پێویستی مرۆڤەکان

حمر النعم: ووشتری سوور کە بەنرخترین ووشترە لای عەرەبەکان

## هەڵسەنگاندن

- کێ بوو مافی بۆ کابرای زوبەیدە وەرگرتەوە لە ئەبی عاص؟
- چەماوەیکێشە بەسەر وەڵامی راست لە ئەمانەی خوارەوە

١ - پیاوە زوبەیدیەکە بەکەل وپەلەوە هات لە

أ - شام          ب - عیراق          ج - یەمەن

٢ -هۆی ناونانی ئەم پەیمانە بەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ کۆبونەوەی سەرانی قورەیش لەسەر

أ -سەرخستنی ستەمکار

ب -سەرخستنی ستەم کارو ستەم لێکراو

ج -سەرخستی ستەم لێکراو

- پێغەمبەری خوا خۆی هاوبەشی ئەم پەیمانەی کردوە کە تەمەنی

أ - بیست ساڵ بوو

ب - تەمەنی سی ساڵ بوو

ج - چل ساڵ بوو

٣ -ئەم بۆشاییە بە وشەی گونجاو پڕبکەوە

پیغەمبەری خوا باس ومەدحی ئەم پەیمانەی کردوە فەرمووی ........

## وانەی حەوتەم

### شوکردنی خەدیجەی کچی خوەیلید بە پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)



مامۆستا ووتی بە قوتابیان: ژیانی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەی کورەکانم سەرتاپای پاک و خاوێن و روناک و رەوشن بوو وە خۆی ڕاستگۆ وئەمین ودەست پاک وبەخشندە بووە وەگەورەترینی کۆمەڵی جوامێرانە بوو وە جوانترین خورەوشتی هەبوو لە دراوسێ یەتی دا هەتاکو گەڵەکەی ناویان نابوو بە (الصادق الامين) راست گۆی دەست پاک .

وە لە شاری مەککەش چەندەها ئافرەت هەبوون سەروکاری بازرگانیان دەکرد وە پیاویان بەکرێ دەگرت بۆ بازرگانی کردن بۆیان لەمال و سامانیان وە بە ناو بانگترینیان خەدیجەی کچی خوەیلید بوو (رضی الله عنها) خاوەن سامان و جوانی بوو وە ئافرەتیکی ژیر و بە سەلیقە و خاوەن خورەوشتی باش بوو کە مێردەکەی وەفاتی کرد ئەو گەنج بوو .
خەدیجە کە خورەوشتی پێغەمبەری زانی لە بەخشندەیی و دەست پاکی و ژیری وە حەزی کرد سەروکاری بازرگانی بۆ بکات و بچێتە شام بەرامبەر کرێی زیاتر لە خەڵکی مەککە وە (موحەممەد)یش رازی بوو وە سەفەری کرد بۆ بازرگانی بۆ شام وە خەدیجەش خزمەتکارێکی خۆی کە ناوی مەیسەرە بوو لەگەڵی دا نارد.
وە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) گەرایەوە لەم سەفەرە بەکۆڵێ قازانج وە مەیسەرەش باسی سەفەرەکەی و باسی موحەممەدی لای خەدیجە کرد لەوەی دیبوی لە خورەوشتی موحەممەد و دەست پاکی وە چەندەها شتی تری لێ دیت، خەدیجە سەرسام بوو بە خورەوشتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)
وە خەدیجە حەزی لە شوکردن بوو بۆ موحەممەد بەلام چۆن بیگاتی و بۆی باس بکرێ بەلام خەدیجە بیری کردەوە لە پاشان بەدوای کارە کەرەکەی خۆی نارد کە ناوی مەیسەرە بوو بۆ وەرگرتنی راو بۆچونی وە مەیسەرە گەرایەوە بەدەم بە پیکەنین و بە خەدیجەی راگەیاند کە موحەممەد رازی بووە بە ژن هینان و خواستنی خەدیجە.

**خواستنی موحەممەد بۆ خەدیجە و مارکردنی:**

خەدیجە زۆر کەیف خۆش بوو بەم هەواڵە و وە هەڵسا خۆی ئامادەکرد بۆ ئەم خوازبێنیە پیرۆزە موحەممەدیش چووە لای مامەکانی و پێی ڕاگەیاند کەوا دەیەوی خەدیجە بخوازی ومارەی بکات وە ئەوانیش چوونە ماڵی خەدیجە و خەدیجەش بە دوای مامەکانی دا نارد عەمری کوری ئەسەد بۆ ئامادە بوونی مارەکردنەکە هات چونکە باوکی کۆچی دوای کرد بوو وە مامی پێغەمبەر ئەبو طالیب خەدیجەی بۆ خوازبێنی کرد ولەووتەکانی ئەمە بوو ووتی: ئەمە کوری برامە موحەممەدی کوری عەبدوللایە لەگەڵ هەر پیاوێکا وەزن بکرێ ئەوا خۆی گرانتر وبەشەرەفترە وگەورەتر وپلەو پایەی بەرزترە وعاقل وژیر ترە، لەگەڵ هەندێ کە ماڵ وسامانی کەمە وهەژارە چونکە ماڵ وسامان چڵکی دەستەو بەرەو نەمان وفەنابوون دەچێ وە شتێکی خواستنەو دەبێ بگێریتەوە بۆ خاوەنەکەی خۆی وە سوێندم بەخوا لە ئایندەدا کارێکی گەورەی دەبێت وە هاتوین بۆ داخوازی کچتان کە خەدیجەیە بۆ برازام، وە تەمەنی پێغەمبەر لەو کاتەی خەدیجەی مارەکرد بیست وپێنج ساڵ بوو وە تەمەنی خەدیجەش چل ساڵ بوو.

**منالەکانی پێغەمبەر:**

خەدیجە لە پێغەمبەری خوا چەندەها منالّی بوو لە کوڕ وکچ لەوانە قاسم وعەبدوللا وطیب، کوڕەکان هەموویان پێش ئیسلام کۆچیان کرد ونەمان وە لە کچانیش زەینەب وروقیە وئوم کەلسوم وفاطیمە، سلاوی خوایان لێ بێت. وە ئەمانە بوونە ئیسلام وکۆچیان کرد بۆ مەدینەی منەوەرە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

وە لەوکاتەی وەحی بۆ پێغەمبەر هات گەورەمان دایکمان خەدیجە یەکەم کەس بوو لە ئافرەتان ئیمانی هێناو بووە پالپشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بانگەوازی ئیسلامەتی پێش کۆچی بۆ مەدینە وە پێغەمبەری خوا بە وەفا بوو بەرامبەر خەدیجە چ لەژیانیدا وە چ لە مردووی دا وە لەپاش وەفاتی دا سەردانی دەستە خوشکەکانی خەدیجەی دەکرد لە مەدینەی منەوەرە وە دیاری وبەخششی بۆ دەبردن هەتا کۆچی یان کرد.

**سودێک :**

[illegible]

خەدیجە کچی خوەیلید کوڕی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزای کوڕی قوصەی کوڕی کیلاب کوڕی کوڕەی موڕی لوئەی کوڕی غالیب کوڕی فەهر

## هەڵسەنگاندن

١ چەماوە بکێشە بەدەوری وەڵامی ڕاست لەمانەی خوارەوە:

أ ـ لەمەککە چەندەها ئافرەت سەروکاری بازرگانیان دەکرد وە بەناوبانگترینیان

١ـ هیندی کچی عوتبە ٢ـ خەدیجەی کچی خوەیلید ٣ـ ئامینەی کچی وەهب

ب ـ خەدیجە حەزی لە شوکردن بوو بە موحەمەد لەبەر

١ ـ دەولەمەندی ٢ ـ دەست پاکی ٣ ـ نزیکی خزمایەتی

٢ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە تەواو بکە

أ ـ خەدیجە خزمەتکارێکی لەگەڵ موحەمەد بۆ بازرگانی نارد بۆ شام کەناوی ــــــــــ بوو وە پێغەمبەر بە قازانجی ــــــــــ گەڕایەوە

ب ـ منالەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دایکمان خەدیجە لە کوڕان ئەمانە بوون قاسم و ــــــــــ وە ــــــــــ

ج ـ کچەکانی پێغەمبەر لە خەدیجە ئەمانە بوون زەینەب و....... وە ئوم کەلسوم و ــــــــــ بوون

٣ پێغەمبەری خوا بەوەفا بوو بۆ خەدیجە (رضى الله عنها) لەم وانەیەی کە خوێندت ڕوونی بکەرەوە.

## وانـەی هەشتەم

### هاوبەشی کردنی پێغەمبەر لە دروست کردنی کەعبەی پیرۆز



مامۆستا بە قوتابیەکانی ووت: کەعبەی پیرۆز نیشانەیەکی گەورەیە بۆ خواپەرستی بۆ خوای تاک وتەنیا وە بۆ یەکریزی موسلمانان لە سەرەتاسەری جیهان. وە عەرەبەکان پێش ئیسلام حەجی یان دەکرد هەموو ساڵی لەسەر شێوەی خۆیان لە مانگە قەدەغەکراوەکان وە قوربانیان لەگەل خۆیان دەبرد بۆ بەگەورەزانینی کەعبەی پیرۆز وە لەپاش ئیسلامەتی ریزی زیاتری لێ نراوە بووە رووگە وقیبلەی موسڵمانان لە نوێژەکانیان دا پاش ئەوەی قیبلە گۆرا لە قودسەوە بۆ کەعبەی پیرۆز وە ریزیان

دەگرت وسەردانیان دەکرد بۆ حەج وعەمرە بۆ لێخۆشبوونی خوا بۆیان، وە کەعبەی پیرۆز چەند جارێک تێک دراو بنیات نراوە جارێکیان لەسەردەمی نەفامی پێش هاتنی وەحی بەهۆی داڕمانی دیواری کەعبە بەهۆی باو باران ولافاوەوە.

یەک لە قوتابیان دەستی بەرز کردەوە وداوای مۆڵەتی لە مامۆستا کرد. ئایا خودی پێغەمبەری خوا هاوبەشی لەدروست کردنەوەی کەعبە کردوە ئەی مامۆستا؟

مامۆستا: بەلێ ئەی کوڕم پێغەمبەری خوا بەردی دەهێنا لەسەر شانی پیرۆزی بۆ دروست کردنەوەی دیواری کەعبە خۆی ومامی عەباس هەتا زۆر ماندوو بوو گوێی نەدا بەم ماندوبوونە تەنها لەبەر خۆشەویستی وگەورەیی ئەم مالی خوایە بوو، وە هەروەها هۆزەکانی مەککەش بە دڵ وبەگیان کاریان دەکرد بۆ چاکردنەوەی دیواری کەعبە وایان دانا کە ئەوەی خزمەتی مالی خوا بکات تووشی سەربەرزی وگەورەیی زۆر دەبێت.

**چیروکی بەردە ردشەکە (الحجر الاسود):**

لەوکاتەی دیواری کەعبەی بەرزکراوە تا گەیشتە شوێنی دانانی بەردە رەشەکە (الحجر الاسود). هۆزەکانی عەرەبی مەککە ناکۆکیان لی پەیدابوو هەر هۆزەو دەیویست ئەم شەرەفە وگەورەیی یە بەنسیبی ئەوبێ وە ئەم ناکۆکیە درێژەی کێشا تا وای لێهات نزیک بوو شەروکوشتاری لی پەیدابێ، وە لەم کاتەدا یەکێک ووتی با ئاشت بینەوە چارەسەری بۆ دابنێن ئەویش ئەو

کەسە دادپەروەرمان بێت کە ئێستا یەکەم کەس لەم دەرگای کەعبەوە دێتە ژوورەوە وە هەموویان رازی بوون و وەهەموویان چاوەنواری ئەو کەسەبوون داخوا کێ بێ.
وە پیاوێ هاتە ژوورەوە ویەکێ بانگی کرد ئەوە موحەمەدی دەست پاک بوو ئێمە رازین بەحوکمی ئەو وەکەیف خۆشی ئەو ناوەی پرکرد ئەو پیاوە بوو کە دەست پاک وئەمین وراست گۆبوو ئەوانیش پێ یان گوت، روداوەکە ئەویش داوای پارچە قوماشێکی کرد ولە سەر زەوی ڕای خست وبەدەستی خۆی بەردەرەشەکەی خستە سەر قوماشەکە هەلیان گرت وە بەرزیان کردەوە تاکو جێگای خۆی وە خۆیشی وبەدەستی پیرۆزی بەردەکەی خستە شوێنی خۆی وە هەموو رازی بوون بەم دادوەریە وبەم جۆرە ئاشتی کردنەوە لە شەر وئاشوب رزگاریان بوو.
یەک لە قوتابیەکان داوای مۆلەتی کردو ووتی: پێغەمبەرمان زیرەک وبلیمەت بوو ودانا بوو ئەی مامۆستا؟
مامۆستا: بەلێ ئەی کوڕم پێغەمبەر بەهۆی ئازایەتی ودانایی وزیرەکی خۆیەوە توانی مەترسی ئەم شەرە دوورخاتەوە وتەبایی وئاشتی بەرپا بکات.

## هەڵسەنگاندن

١. ئەم بۆشیانە پڕبکەوە

أ ـ کەعبەی پیرۆز ڕوخا لەسەردەمی نەفامی بەهۆی ........

ب ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاوبەشی دروست کردنی کەعبەی کرد لەگەڵ مامی ..........

ج ـ عەرەبەکان کەعبەیان پیرۆز ڕادەگرت وە حەجیان دەکرد و ..........

د ـ هۆزەکان ڕازی بوون بە ........ دادوەربێت لەنێوانیان وە لەسەر دانانی بەردەرەشەکە لەشوێنی خۆی.

٢. بۆچی هەموو هۆزەکان دەیانویست ئەوەی دێتە ژوورەوە بۆ دادوەریان بێت لە دانانی بەردەرەشەکە کێ بێ؟

٣. ئەو چارەسەرە دانایی یە چی بوو کە پێغەمبەر کردنی بۆ دانانی بەردەرەشەکە؟

وانـەی نـۆیەم

## مزگێنی پێغەمبەرایەتی



مامۆستا بە قوتابیەکانی ووت: پێغەمبەری خوا جوانترین خورەوشتی هەبوو، وەبەرێزتر بوو وە بلیمەت بوو وە چاکترین کەس بوو بۆ دراوسێ یەتی، وە راست گوترین کەس بوو بۆ قسەکردن وە گەورەترین دەست پاک بوو وەگەلەکەی ناویان نابوو بە راستگۆی ئەمین (الصادق الامین).

وە مزگێنی پێغەمبەرایەتی هەر لەکاتی لە دایک بوونیەوە بریسکەی دەدا وە یەکەم نیشانەی پێغەمبەرایەتی، ئەوەبوو کە رووی دا کەوا پیت وبەرەکەت رووی لەماڵی حەلیمە کرد کە دایانی پێغەمبەر بوو لەو کاتەی موحەممەددیان بردە وە بۆ ماڵەوە کەوا لەپاش گرانی وووشکە ساڵی زەوی گەشایەوە وگوانی مەڕەکان پڕ بوو لەشیر.

لەپاشان ئەوەش کە رووی دا لە سنگ لەت کردنی ودەرکردنی بەشی شەیتان لە نێو سنگی دا.

وە خوای گەورە لە سەفەرەکەی موحەمەد بۆ شام پەڵە هەورێکی رام کردبوو بۆی کە سێبەری بۆ دەکرد لە رۆژی گەرمای نیوەرۆ ئەوەش بۆ کەس نەکراوە تەنها بۆ ئەو نەبێت، وە ئەم رووداوەش مەیسەرەی خزمەت کاری خەدیجە (رضی الله عنها) دەگێڕێتەوە کە لەگەڵی دابوو لەسەفەری شام.

**دار وبەرد سلاویان لێ دەکرد**

قوتابی یەک پرسیاری کرد: ئایا راستە دار وبەرد سڵاویان لە پێغەمبەر کرد ئەی مامۆستا؟

مامۆستا: بەلێ ئەی کوڕی خۆم پێغەمبەری خوا هەرکاتێ دەرچووبا بۆ تارەت کردن دووردەکەوتەوە بۆ دەشت ودەر هەتا دەگەیشتە نێوان گردۆلکەو شیوو وەبەلای هەر داروبەردێک دارۆیشتبا ئەوە گوێ ی لە دار وبەرد دەبوو سڵاویان لێ دەکرد ودەیان ووت (الصلاة والسلام علیک یا رسول الله) ئەویش تەماشای لای راستی وچەپی وپاشەوەی دەکرد کەسی نەدەدیت تەنها دارو بەرد نەبێ.

**پەڕاوە ئاسمانیەکان مژدەی پێ دەدەن**

قوتابیەکی تر پرسیاری کرد. ئەی مامۆستا ئایا مزگێنی پێغەمبەرایەتی لە تەورات وئینجیل هاتووە؟

مامۆستا: بەڵێ ئەی کوڕی خۆم، لە تەورات مزگێنی هاتنی ئەو پێغەمبەرە هاتووە هەر وەکو قورئانی پیرۆز باسی کردوە کە دەفەرموێ: (ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾) البقرە١٤٦ واتە: ئەوانەی کتێبمان پێ بەخشیوون پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەناسن هەروەک چۆن نەوەکانی خۆیان دەناسن، بێ گومان دەستەیەک لەوان ئەو ڕاستیە دەشارنەوە، لە کاتێکدا دەشزانن موحەممەد فرستادەی خوایە (تەفسیری ئاسان ل٢٣) وە جولەکەکان لەمەدینەی پیرۆز باسی هاتنی پێغەمبەریان دەکرد بۆ عەرەبەکانی مەدینە لە ئەوس وخەزرەج وە دەیان ترساندن بەو، وەهەر ئەمەش بووە هۆی هاتنی هۆزی ئەوس وخەزرەج بۆ ناو ئیسلامەتی.

وە مژدەی ئینجلیش. هەروەکو لەقورئان ئاماژەی پێ کراوە کە خوای گەورە دەفەرمووێ لەسەر زمانی عیسای کوڕی مەریەم (علیهما السلام):

(.........وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ.......................﴿٦﴾ ) الصف:٦

(من مژدەدەرێکم بە پێغەمبەرێک کە لە دوای من دێت ناوی ئەحمەدە تێرو تەواوە، نیشانە وموعجیزەی ئاشکراوە) تەفسیری ئاسان ل٥٥٢

وە هەندێک لە عەرەبەکان کە ببونە فەلە وچووبونە سەر ئاینی عیسا پێغەمبەر وەکو (ئومەیەی کوڕی صەڵت) زۆر جار دەیان ووت وەسفی وسیفەتی ئەو پێغەمبەرە لە تەورات وپەڕاوی ئێمە هەیە کە بۆ ئەم

وولاتانە دێت، وە هەروەها سەلمانی فارسی (رضی الله عنه) دەگێڕێتەوە دەربارەی خۆی کەوا هاوەلایەتی قەشەیەکی کردوە زۆر جاران دەیوت ئەی سەلمان خوای گەورە لە ئایندەدا پێغەمبەرێ دەنێرێ ناوی ئەحمەدە ولەنێوان کێوەکانی توهامە (لەدورگەی عەرەب) پەیدا دەبێت وە نیشانەی ئەو پێغەمبەرە ئەوەیە کە دیاری وەردەگرێ بەڵام خێر وصەدەقە وەرناگرێ، وە هەر ئەم جۆرە قسانە بوو بەهۆی موسڵمان بوونی سەلمانی فارسی (رضی الله عنه) لە پاشان پێغەمبەری خوا هەر خەوێکی شەوێ دیبای بۆ بەیانی یەکەی ڕاست دەردەچوو، وە خۆشی حەزی لە تەنیایی دەبوو وە زۆر دەچووە ناو ئەشکەوتی حیرا، خواپەرستی تێدا دەکرد چەندەها شەو لەوێ دەمایەوە لە هەموو مانگان وە پێخۆر وخواردنی لەگەڵ خۆی دەبرد وبەردەوام بوو تا ئەو کاتەی سروشی بۆ هات.

## هەڵسەنگاندن

١. باسی هەندێ سیفەتی پێغەمبەر بکە کە لێی زانراوە **پێش هاتنی** وەحی؟

٢. باسی سێ رووداو بکە کە دەیسەلمێنێ کە موحەمەد **پێغەمبەری ئەم** گەلەیە؟

٣. مژدەی پێغەمبەرایەتی لە تەورات وئینجیل هاتووە بۆیە **باسیان بکە** کە بەلگەیە لەسەر ئەمە؟

٤. ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕ بکەوە.

**أ - لە مژدەی پێغەمبەرایەتی کە لەپێش دابەزینی وەحی هاتووە خەونی.......... وەسلاوی کردنی دارو.......... بۆی.**

**ب - سەلمانی فارسی هاوڕێیەتی قەشەیەکی کرد وهەموو جارێک دەی ووت بە سەلمانی فارسی خوای گەورە لە ئایندەدا پێغەمبەرێ دەنێرێ ناوی..........**

## وانەی دەیەم

### دابەزینی وەحی بۆ سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)



خالید ووتی بەدایکی: من زۆرم حەز لە وانەکانی ژیانی پێغەمبەرە ئەی دایکە چونکە ژیانی پێغەمبەر پڕە لە ڕووداوی هاندەر، وە هەرکاتێ مامۆستا باسی وانەیەکی بۆ بکردبمایە موشتاقی گوێ بیستی ئەم دەرسە دەبووم وە ئەمڕۆ مامۆستا باسی چیرۆکی هاتنی وەحی بوو بۆ پێغەمبەری خوای کرد.

دایکی خالید: پێم بڵێ باسی هاتنی وەحی چی بوو.

خالید: خوای گەورە وای لە پێغەمبەر کرد تەنیایی پێ خۆش بێت لە ئەشکەوتی حیرا دوور لەخەڵکی.

فاتیمە: ئەشکەوتی حیرا شوێنەکەی لە کوێوەبوو؟

دایکی خالید: ئەشکەوتی حیرا کەوتۆتە سەر شاخێک لە شاخەکانی کە بەسەر مەککە دەڕوانێ چەند میلێک لە مەککەوە دوورە موسڵمانان ناویان ناوە چیای نور.

خالید: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شەوان دەچووە ئەشکەوتەکە وخواپەرستی تیایدا دەکرد جارێک دەشەو دەمایەوە وەجارێک زیاتر وە یان کەمتر وە هەندێک جاریش مانگێک دەمایەوە وە خواردن وخواردنەوەی لەگەڵ خۆی دەبرد وەهەتا خواردنی کۆتایی دەهات ئینجا دەگەڕایەوە هەم دیسان دەگەڕایەوە بۆ ئەشکەوتەکە، وە ئابەم جۆرە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چەند کاتێک لەوێ دەمایەوە تا ئەوە بوو شەوێ لە شەوان وەحی بۆهات و کەدەفەرمووێ: جوبرائیل فریشتەی وەحی بوو هاتەلام ومنیش خەوتبووم لەناو پۆشاکێک دا بووم جوبرائیل کتێبێکی بۆ هێنام لەناو دیباج دابوو فەرمووی: (اقرأ) واتە: بخوێنە منیش ووتم خوێندەوارنیم دەفەرمووێ منی گوشی وتاوام زانی دەمرم لەپاشان بەری دام وفەرمووی: بخوێنە منیش گوتم: خوێندەوارنیم دیسان منی گوشی بەخۆیەوە تاکو هەستم بە ماندووبون کرد لە پاشان بەری دام وفەرمووی بخوێنە ووتم من خوێندەوارنیم.

لەسێیەم جار گوشیمی وبەری دام فەرمووی: ( ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾)علق ١-٥ واتە: ئەی موحەممەد بخوێنە بەناوی ئەو خوایەی کە پەروەردگارتە کە هەموو شتێکی دروست کردوە. ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناومنداڵدان)دروستکردوە. بخوێنە لە کاتێکدا پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانست وزانیاری فێرکردوە ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردوە کە نەیزانیون. تەفسیری ئاسان ل٥٩٧

**پێغەمبەرگەڕایەوە ماڵەوە:**

فاتیمە: وە لەپاشان چی روویدا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەی خالید؟

خالید: فریشتە کەرۆیشت وە پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) بەلەرزەوەگەڕایەوەماڵەوەلای خەدیجەی خێزانی وفەرمووی دام پۆشن.. دام پۆشن. ئەوانیش دایان پۆشی هەتا ئەم لەرزەی رۆیشت لەپاشان فەرمووی: ئەی خەدیجە واو وام بەسەر هات هەموو رووداوەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوە لەپاشان بە خەدیجەی فەرموو من ترسم لێ نیشتووە.

**هەڵوێستی خەدیجە** (رضی الله عنها) :

فاتیمە: خەدیجە چی کرد بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

دایکی خالید:خەدیجەخان ئافرتێکی زیرک وژیروبە سەلیقە بوو وە خورەوشتی جوان وچاک بوو وە خورەوشتی موحەممەدی باش دەناسی وەزانی کە موحەممەد نابێت جنۆکە دەستیان لێ وەشاندبێ بۆیە هێوری کردەوە ودڵ دامەزراوی کردو پێی فەرموو سوێندم بە خوا، خودا شەرمەزارو سەر شۆڕت ناکات چونکە لەگوفتاردا راست گۆی ولەئەمانەت دەس پاکی وسەردانی خزم خوێش دەکەی لە پاشان وای بە چاک زانی بیباتە لای وەرەقەی کوری نەوفەلی ئاموزای کە پیروبەسالاچوو بوو ببووە گاور وتەورات وئینجیلی دەنوسیەوە، وە خەدیجە پێ فەرموو: ئەی ئاموزام گوی لەکوڕی برات موحەممەد راگرەکە ڕودا وی خوی بوت باس بکات وەرەقەش ووتی بە موحەممەد، ئەی کوری برام چیت دیوە؟

موحەممەدیش چی د یبوی بۆ وەرەقەی گێڕایەوە وەرەقەش ووتی ئەوە ئەوفریشتەیە وەحی بۆهێنای هەروەکو بۆلای موساو عیساش هاتبوو سوێندم بەخوا خۆزگە ئەوکاتەی گەڵەکەت دەرت دەکەن من گەنج بومایە یارمەتیم بدا بای، موحەممەدیش بەسەرسورمانێکەوە فەرمووی ئایا گەلەکەم دەرم دەکەن؟!

وەرەقەش ووتی بەلێ هیچ کەسی نەهاتووە وەکو تۆ کە دەرنەکرابێ وە ئەگەر بمێنم تا ئەوکاتە بەسەرت دەخەم.

خالید: وەحی دەستپێکرد بۆ سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پاش ئەوەی کەمێک وەستا. هەتاکو پێغەمبەری خوا هێزی نابەرەوە توانی شانی خۆی بداتەبەر ئەزیەت ونارەحەتی بانگەوازی بۆ ئایینی نوێ کە ئاینی ئیسلامە.

**ئایا دەزانی:**

نمط: پارچە قوماشێک،

الجهد : ماندوبوون

الدیباج: جۆرێکە لە ئاوریشم

زملونی: دام پۆشن

غطنی:گوشیمی بەتوندی

یومک : ئەو رۆژەی لەمەککە دەرت دەکەن

الناموس: وەحی

## هەڵسەنگاندن

١ باسی ئەو گفت وگویە بکە کە لەنێوان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وجوبرائیل (علیه‌السلام)ی روی دا لە ئەشکەوتی؟

٢ بۆچی خەدیجە موحەممەدی بردە لای وەرەقەی ئامۆزای؟

٣ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەووشەی گونجاو پڕ بکەوە

أ -ئەو ئەشکەوتەی کە پێغەمبەر تێیدا خواپەرستی دەکرد ناوی______لە کێوی______

ب - موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دەلەرزی وبەخەدیجەی ووت______

ج -وەرەقە بەپێغەمبەری ووت خۆزگە ئەو کاتە گەنج دەبووم کە______

## وانەی یازدەهەم

### بانگەوازی نهێنی



مامۆستا ووتی: کاتێکی زۆری نەخایاند لەسەر دابەزینی وەحی بۆ سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەتاکو پێغەمبەر دەستی کرد بە بانگەوازی ئیسلام وە بەو خزمە نزیکانەی کە سیقە ومتمانەی پێ بوون وەنەی توانی یەکسەر هەموو قورەیش بانگ بکات، ئەوکات

یەک لەقوتابیان داوای مۆڵەتی کردو ووتی: بۆچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەرەتادا خەڵکی بانگ نەکرد بۆ ئیسلام بەگشتی ئەی مامۆستاگیان، وەکەچی ئیسلام دینی بەبەزەیی بوو بۆ هەموو جیهان؟
مامۆستا: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەستی بە بانگەوازی بەنهێنی کرد لەسەرەتادا لە ترسی بەدرۆ خستنەوەی خەڵکی بۆی یان خەڵکی پشتی تێ بکەن چونکە ئەم بانگەوازە شتێکی تازە بوو بۆ قورەیش وعەرەب لەم کاتەدا وە بەتایبەتی ئەوان بت پەرست بوون.
قوتابیەکی تر داوای مۆڵەتی کردوو ووتی: ئەی مامۆستا ئەی چۆن خەڵکی هاتنە ناو ئاینی ئیسلام؟

**موسڵمانە پێشینەکان بۆئیسلام:**

مامۆستا: پێغەمبەری خوا بانگی ئەو کەسانەی متمانەی پێ هەبوون بانگی دەکردن، وە خەدیجەی خێزانی وکوڕی مامی عەلی کوڕی ئەبوطالب وەخزمەتکەری زەیدی کوڕی حاریسە وبرادەری خۆی ئەبوبەکری صەدیق وراستگۆ، وە ئەوانە هەموویان یەکەمین وپێشینەکان بوون بۆ ئیسلام وموسڵمان بوون لە ئافرەت وپیاوان ومناڵان وە ئەوانەش هەرکەسەو بانگی خزم وکەسی خۆیان کرد کەوا متمانە وسیقەیان پێ هەبوو، وە ئەبوبەکر بانگی عوسمانی کوڕی عەفان و تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلای کرد وەهەر دووکیان وەڵامی ئەبوبەکریان داوەوەموسڵمان بوون وەهەروەها بانگی ئەوکەسانەیان دەکرد کە لەدورەوە هاتنە مەککە لەکات و ساتی حەج دا وە بەم هۆیەوە چەند کە سانێک موسلمان بوون وە هاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وموسڵمان بوون

وئیسلامەتی خۆیان بەنهێنی ئەنجام دەداو وەئەم بانگەوازی ڕێگای ڕاستی ،لەسەرەتاوە چەند کەسانێکی دیاری کراو بوون لە ئافرت و پیاو، قوتابیەک پرسیاری کرد ئەی مامۆستا موحەممەدچی کرد؟

**موسڵمانان لەماڵی ئەرقەم:**

مامۆستا: قورئانی پیرۆز بەشێ لەدوای بەشێ دادەبەزی بۆ پێغەمبەری خوا بۆ پەروەردەکردنی هاوەڵانی لەسەر ڕێنمایی یەکانی قورئانی پیرۆز وەهاوەڵان هەڵسان بە بانگک کردنی خەڵکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)هەتا گەیشتە چل کەس وەپێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)پێ ی باش بوو موسلمانان کۆبکاتەوە لەشوێنێ کە دوور دەستی بێ بڕوایانو قورەیش بێت وە هاوەڵی کەناوی ئەرقەمی کوری ئەرقەم بوومالی خۆی بەخشی بۆ بوونی بارەگاو بنکەی بانگەوازی نهێنی بۆ ئیسلام وە چوونو هاتنی موسلمان بۆ ئەوشوێنە بەنهێنی وخۆپاریزی بوو نەبادە بێباوەران پێ بزانن وە پێغەمبەر ی خواش وانەی ئاینی ئیسلامی پێ ڕاگەیاندن وەپەروەردەی دەکردن لەسەر بناغەی یەکتا پەرستی وخوڕوەشت بەرزی وەدەری دێنان لەخورەوشت وبیر وباوەری نەفامی ونەزانی وە پەروەردەو خۆئامادەکردنی هاوەلان بۆ بەرگەگرتنی هەرئێش وئازارێک.

وە لەو ماڵەی دا ... بیلال کوری ریباحی حەبەشی، عەماری کوری یاسر وسوهەیبی رۆمی وحەمزەی کوری عەبدولموتەلیب وعومەری کوری خەطاب زۆربەی گەنجەکان موسڵمان بوون وهاتنە نێو ریزی بڕواداران وە تاوای لێهات ماڵی ئەرقەم تەنگ بوو بۆیان لەبەر زۆری ژمارەی گەنجە موسڵمانە تازە پێگەیشتووان، وە قورئانی پیرۆز پەیتا پەیتا دادەبەزی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

قوتابییەک داوای مۆڵەتی کردو ووتی: ئەم بانگەوازی ئیسلامە چەند گەورەیە کە لە سەرەتاوە بەم کۆمەڵە گەنجە دەستی پێ کرد لە پاشان بە هەموو زەوی بلاوبۆوە!

مامۆستا: بەلێ ئەی کورەکانم، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) خۆی مۆری پێغەمبەرایەتی بوو وە دواین پێغەمبەرە وبانگەوازەکەی گشتگیرە وبۆ هەموو نەوەکان ورەحمەت وبەزەیی یە بۆ جیهانیان.

**هەڵسەنگاندن**

چەماوە بکێشە بەدەوری وەلامی راست لەمانەی خوارەوە:

یەکەم کەسی کە بڕوای بە ئیسلام هێنا وپێغەمبەری بەڕاستگو **دانا لە** پیاوان

○ عومەری کوری خەتاب ○ ئەبو بەکری راستگۆ ○ حەمزەی کوری عەبدولموتەلیب

لەئافرەتان

○ ئەسمأ کچی ئەبو بەکر ○ خەدیجەی کچی خوەیلید ○ صەفیەی پوری پێغەمبەر

وە لەمنالان

○ تەلحەی کوڕی عوبەیدللا ○ بیلال کوری ریباح ○ عەلی کوڕی ئەبو طالیب

بۆچی پێغەمبەری خوا لەسەرەتا دا بانگی هەموو خەلکی **نەکرد**

ئەم بۆشاییانە بە ووشەی گونجاو کە لەوانەکە دا خوێندوتە پڕ **بکەوە:**

**پێغەمبەری خوا لەسەرەتادا بانگی خزمە نزیکەکانی کرد کە خێزانەکەی ـــــــبوو وەکوڕی مامی ـــــــبوو وەخزمەتکارەکەی ـــــــ**

**ئەبوبەکر بانگی کۆمەڵە گەنجێکی کرد بۆ ئیسلامەتی لەوانە عوسمانی کوڕی عەففان و ـــــــو ـــــــبوون.**

**ژمارەی بڕواداران گەیشتە ......پیاو وەپێغەمبەری خواش مالی گەنجێکی بۆ کردنە بارەگا وبنکەی ئاینی ئیسلام کەمالی ـــــــ بوو.**

**پێغەمبەری خوا وانە وپەروەردەی رێنمایی ئیسلامی فێردەکردن وەپەروەردەی دەکردن لەسەر ـــــــ و ـــــــ**

وانەی دوانزەهەم

## بانگەوازی بەئاشکرا



مامۆستابەقوتابیانی گووت: سێ سال تێپەری وەپێەمبەری خواش(صلی الله علیه وسلم)خەڵکی بانگ دەکردبە نهێنی وەهاوەڵان فێری بنەماکانی ئیسلامی دەبوون وەپەروەردەی دەکردن لەسەر قورئان خوێندن تێ گەیشتنی وەبیرکردنەوەهەتا وەکو وای لێهات خورەوشتی وعادەت وهەڵسوکەوتی ئەوانی گۆری وە لەگەڵ ئەوەشداکەبانگەوازی ئیسلامی بەنهێنی بوو بەلاّم قورەیشیان هەستیان پێ کرد بەلاّم گرینگیان پێ نەدا لەسەرەتاوە وە وایان دانا کە ئەمە کاتیەوبەردەوام نابێت وبانگەوازی ئیسلامدەبرێتەوە.

قوتابیەک داوای مۆڵەتی کردو ووتی:ئایا پێغەمبەرهەربەنهێنی بەردەوام بوو ئەی مامۆستا ؟

مامۆستا: نەخێر ئەی کوڕی خۆم تاکو ئایەتی قورئان دابەزی لە سورەتی (المدثر)کەخوای گەورەفەرموی:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

(يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾) المدثر

واتە: (ئەی ئەوکەسەی خۆت پێچاوەتەوەئەی موحەمەد(صلى الله عليه وسلم) هەستەوە خەلکی بێدارکەوە) تەفسیری ئاسان

وهئایەتی ( ۞ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾) سورەتی الحجر ٩٤

واتە: هەر فەرمانێکت پێدراوە ئەنجامی بدە بەرێک وپێکی، گوێ مەدە بەبوختان ورەفتاری موشریک وهاوەڵگەران) تەفسیری ئاسان ٢٦٧

(وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾) الشعراء ٢١٤

ئەی موحەمەد سەرەتا عەشیرەت و هۆزو کەس وکارت بێداربکەوەو بترسێنە تەفسیری ئاسان ٣٦٧

**پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگی گەلەکەی دەکات:**

پێغەمبەری خوا هەڵسا بە بانگ کردنی خەڵکی بەئاشکرا بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوا ئەوەبوو چووە سەر کێوی سەفا لە نزیکی کەعبە وبانگی خەڵکانی هۆزی قورەیشی کرد وفەرمووی: ئەی نەوەی فەهر ئەی نەوەی عەدی هەتا زۆربەی هۆزەکانی مەککەی بانگ کردن وە خەلکانیش لە چواردەوری کۆبونەوە ئەویش پێیانی فەرموو: ئەگەر پێتان بڵێم ئەوا کۆمەڵێ ئەسپ سواری لە پشت ئەو کێوە هاتوون دەیان نەوێ بدەن بەسەرتان دا ئایا پێم باوەڕ دەکەن؟ ئەوانیش ووتیان تا ئێستا هیچ درۆیەکمان لێ نەبیستووی ئینجا فەرمووی: دە من ترسێنەرم لەنێوان ئێوە لەپێش هاتنی ئێش وئازاری گەورە من پێغەمبەرم رەوانەکراوم لەم کاتە ئەبولەهەبی مامی ووتی دەم ودەم بکەوی لەناو خۆڵدا ئایا بۆ ئەمەت بانگ کردووین ئینجا لەم کاتە ئەم سورەتی (مسد) دابەزی کە خوای گەورە سەرزەنشتی ئەبو لەهەبی کرد وریسوای کرد تا دونیا دونیایە موسلمانان ئەم سورەتە دەخوێننەوە بۆیان بە خواپەرستی حیسابە ولۆمە وسەرزەنشت کردنە بۆ ئەبو لەهەب

وە هەروەها پێغەمبەر نەوەی هاشیمی خزمی خۆی بانگ کرد بۆ ئیسلام بوون بەڵام وەڵامیان نەدایەوە، وە خەڵکان بەهۆی گوفتاری پێغەمبەرەوە ئەم ووشانەی لە سینەیان مایەوە لە گەورە وبچوکیان وە خەلکانیش لەنێوان بەراستگۆ وبەدرۆزانین بوون وەئەمە بوو بە بانگەوازی بەئاشکرا. یەک لەقوتابیان داوای مۆڵەتی کردو ووتی: ئایا قورەیش وازیان لە پێغەمبەر هێنا بە ئازادی بانگەوازی بکات؟ بەبێ ئازار وئەشکەنجە ئەی مامۆستا؟

**قورەیش موحەمەد بەدرۆ دەخەنەوە:**

مامۆستا: نەخێر کورەکانم قورەیشیەکان رەتیان کردەوە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی، وە بەردەوام بوون لەسەر بت پەرستی بە هەنجەتی ئەوەی لەسەر ئاینی باب وباپیرانن، وە بوختانیان بە موحەمەد کرد وهناوناتۆرەیان لێ ناو جارێک بەشێت وجارێک بەجادووباز وجارێ بەشاعیر وجارێ بەچوونی بۆلای نجوم گەرەوە وبەڵام قورئان دووری خستەوە لەم جۆرە بوختانە کە دەفەرموێ: (وَمَاصَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ ) التكوير ٢٢-٢٤

واتە: (دڵنیابن کە هاورێکەتان شێت نی یە وبێگومان موحەمەد جوبرائیلی بینی بە ئاشکرا لەئاسۆی نۆمایندا وە هەرچی پێدەگات لەجیهانی نهێنی وشاراوەکان لێتان ناشارێتەوە راستیتان پێ رادەگەیەنێ) تەفسیری ئاسان ل٥٨٦

وه كۆمەڵێ لە ئافرەتان وپیاوان هاتنە نێو كاروانی موسڵمانان وە دوژمنانی ئیسلام دەستیان كرد بە ئازاردانی موسلمانان بەهەموو شێوەی سزا وەكو بەندكردن ولێدان وخواردن وخواردنەوە لێ بڕین وجۆرەها ئازاری تر

وەدڵیان زۆر ڕەق بوو بەرامبەر موسلمانان وە بەزەیی ورەحمەتی تیانەبوو.

### هەڵسەنگاندن

١. چەماوە بکێشە بەدەوری وەڵامی ڕاست لەمانەی خوارەوە:
بانگەوازی ئیسلامی بە نهێنی چەند ساڵێک مایەوە
○ ٣ ساڵ ○ ٥ ساڵ ○ ٧ ساڵ ١٠ ساڵ

٢. ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە بەووشەی گونجاو
پێغەمبەری خوا دەستی کرد بە بانگەوازی بەئاشکرا وە لەسەر کێوی ــــــــ وەستا
پێغەمبەر بانگی هۆزەکانی عەرەبی کرد لەوانە مامی ئەبو ـــــــــ ووتی: دەم ودەم بکەوی بەناوخۆلدا. ئایا بۆ ئەمەت بانگ کردوین.
خوای گەورە سورەتی ـــــــ ناردە خوارەوە کە دەم کوتی کرد.

٣. موشریکەکان پێغەمبەری خوایان بەدرۆ زانی وبەشێت وبەشاعیر وفالچی وە قورئانیش بەدرۆی خستنەوە باسی ئەو ئایەتانە بنوسە کەباس لەمانە دەکات.

٤. ئایا قورەیش وازیان هێنا لە موحەممەد خەلک بانگ بکات بۆ ئیسلام بە ئازادی بێ ئازاریان. ئەمە روون بکەرەوە؟

**هاندان**

هەندێ قوتابی سورەتی (المدثر) بخوێنن وە هەندێکیان باسی ئەم سورەتە بکەن

## وانەی سیانزدەهەم

### بەدرۆ خستنەوە وگەمە وگاڵتە پێ کردنی



پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەستی کرد بە بانگەوازی بۆ ئیسلام بە ئاشکرا وقورەیشیەکانیش دەستیان کرد بە دوژمنکاری وگاڵتە پێکردن وبەسوک سەیرکردنی بانگەوازەکەی، وە یەکەمین کەس کە دەستی بەم کارە کرد مامی ئەبولەهەب بوو لەوکاتەی بانگی کردن بۆ یەکتاپەرستی وە ئەو پێغەمبەری خوایە ولەلایەن خواوە ناردراوە وە لەدانیشتگاو شوێنی کۆبونەوەیان گەمە وگاڵتەیان پێ دەکرد وە هەرجارێ بەلای موحەمەد دارەتبان بەگاڵتەدەیان ووت ئەوە کوڕی ئەبو کەبشەیە. وە قورئانی پیرۆز هەڵویستی ئەم کافر وبێ بروایانەی ئاشکرا کرد

وفەرمووی: ( وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾)الانبياء ٣٦

واتە: ئەی موحەمەد (صلى الله عليه وسلم) کاتێک ئەوانەی بێ باوەڕبوون تۆ دەبینن هیچ کارێکیان لە دەست نایەت لەگەڵ تۆی بکەن جگەلە گاڵتە جاری (جا بەیەکتر دەڵێن ئا ئەمەیە باسی خواکانتان دەکات؟! لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە بێ باوەڕن بە قورئانی خوای میهرەبان ) تەفسیری ئاسان ل٣٢٥

وە قورەیشیەکان بەوە نەوەستان تەنها بەگاڵتە وگەپەوە بەڵکو چەندەها بوختان وشتی پڕوپوچ ونارەوایان دەخستە پاڵ پێغەمبەر وە دەیان ووت کە درۆزنە وجادوگەرە وشاعیرە ونەجوم گرە وشێتە، بەڵام ئەم ووشانە هیچ کامێکیان پێغەمبەری خوای سارد نەکردەوە کە واز لە بانگەوازەکەی بهێنێ بەلکو لەجاران سوورتر دەبوو وە سەبر وئارامی دەگرت داوای پاداشتی لەخوا دەکرد.

وەلەم کاتەدا ئەم ئایەتە دابەزی کە خوای گەورە دەفەرموێ: ( وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾) الحجر ٩٧-٩٩

واتە: (سوێند بە خوا ئێمە چاک دەزانین کە بەراستی دڵی تۆ تەنگ دەبێت بەو گوفتارە نابەجێیانەی کە خوانەناسان دەیڵێن . جا لەهەموو کاتێک بەتایبەت لەکاتی دڵ تەنگیداتەسبیحات وسوپاس وستایشی پەروەردگارت بکە ولەڕیزی سوژدەبەراندا بە. بەردەوامیش پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگری ئەوکاتە ئیتر بەیەک جاری رزگارت دەبێت لەهەموو ناخۆشیەکان) تەفسیری ئاسان ل٢٦٧

وه خوای گەورە دەفەرمووێ: ( إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ) الحجر ٩٥
واته:(ئێمه تۆ دەپارێزین لەشەڕ و پیلانی گاڵتەچی وگاڵتەجاران) تەفسیری ئاسان ل٢٦٧

بەڕاستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) به قسەی ئەوان دڵ تەنگ دەبوو بەڵام بۆ خەڵکی نەی دەدرکاند بەڵام له ڕەنگ ودەم وچاوی بەدیاردەکەوت وه لەگەڵ ئەوەشدا هەر سوور بوو لەسەر گەیاندنی بانگەوازەکەی

وه دەبێ بانگ خوازان یان هەر موسڵمانێ که بیەوێ بۆ ئیسلام بانگ بکات نابێت گەمه وگاڵتەجاری بێ بروایان ساردی بکاتەوه وبەڵکو دەبێ بەردەوام بێت بۆ گەیاندنی ئیسلام بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی به پلەی ئەجرو پاداشتی گەورە لەلایەن خوای گەورە وبەبەزەیی.

ئایا دەزانی:
ئەبو کەبشە: مێردی حەلیمەی دایانی پێغەمبەر بوو.

## هەڵسەنگاندن

١ نیشانەی (✔) بەرامبەر وەڵامی ڕاست ونیشانەی (×) **چەوت** بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ

**أ - یەکەمین کەس کە پێغەمبەری خوایان بەدرۆ خستەوە ئەبو لەهەب بوو.**

**ب -موشریک وبێ بڕواکان هەموویان بڕوایان هێنا وئازاری پێغەمبەریان نەدا لەوکاتەی بانگی کردن بۆ ئیسلام.**

**ج -پێغەمبەری خوا نەوەستا لە بانگ کردن بۆ ئیسلام لەگەڵ ئەم هەموو گەمە وگاڵتە پێ کردنەی بێ بڕوایان بۆی.**

٢ باسی وێنەیەک لەوێنەکانی گەمەو گاڵتەی بێ بڕوایان **بکە بۆ** پێغەمبەری خوا؟

٣ مەبەستی بێ بڕوایان چی بوو لەگەمە وگاڵتە پێ کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)؟

وانەی چواردەهەم

## یەکسانی



گەورەکانی قورەیش بیری ئەوەیان کردەوە بە چەندەها وەسیلە هەوڵیان دا رێگری بکەن لە پێغەمبەری خوا لە گەیاندنی بانگەوازەکەی وە بڕیاریان دا کە چەند شتێکی لەبەردەم دابنێن تاکو وازبێنێ لەم بیروباوەرەی کە تازە هێناویەتی وە بگەرێتەوە سەر بت پەرستی وئاینی ئەوان. وە تاوای لێهات ئەبی وەلیدی عوتبەی کوڕی رەبیعە بچێتەلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قسەی لەگەل بکات وچەند پێشنیارێکی لە پێش دانێ وساردی بکاتەوە لەسەر بانگەوازەکەی ووتی: ئەی کوڕی

برام ئەگەر هۆی ئەم بانگەوازەی کە هێناوتە کۆکردنەوەی ماڵ وسامانە ئەوا ماڵ وسامانێکی زۆرت بۆ کۆدەکەینەوە تا ببی بەدەوڵەمەندترینمان، وە ئەگەر دەتەوێ ببیتە گەورەمان دەتکەینە گەورەی هەمووومان، وە ئەگەر پاشایەتیت دەوێ دەتکەینە پاشا وسەرۆکی هەمووومان وە ئەگەر ئەو بانگەوازەی کە بانگی بۆ دەکەیت جنۆکە دەستیان لێ وەشاندووی یان نەخۆشی چارەسەرت بۆ دەکەین، وە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی ئەی باوکی وەلید قسەت کۆتایی هات ئەویش ووتی بەڵێ، پێغەمبەری خواش فەرمووی: دەگوێم بۆ بگرەوەئەم چەند ئایەتەی لەسورەتی (فصلت)بۆخوێندەوەتادەگاتە:( ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ) فصلت ١٣ بگەرێوە بۆ تەفسیری ئاسان لە ل٤٧٧-٤٧٨

لەپاشان عوتبە هەڵساو دەستی بە دەمی پێغەمبەری خواوەناو داوای کرد واز لە خوێندنەوەی ئایەتەکان بهێنێ لە توندی تەئسیری ئەم ئایەتە لەسەری لە پاشان گەڕایەوە بۆ لای گەورە گەورەی قورەیشان ومەدح وسەنای قورئان وئیسلامی کرد، ئەوانیش پێ یان ووت موحەممەد جادوی لێکردووی موحەممەد جادوگەرە

وه له‌جاری دووه‌م پێشنیاری تریان خسته به‌رده‌م پێغه‌مبه‌رو ووتیان رۆژێ خوات ده‌په‌رستین ورۆژێ خوای ئێمه بپه‌رسته ئه‌ویش ره‌تی کرده‌وه ئه‌م سوره‌ته دابه‌زی له‌سه‌ر ووته‌ی ئه‌وان که ده‌فه‌رموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾) الكافرون ١-٦

واته: ئه‌ی موحه‌ممه‌د (صلى الله عليه وسلم) بلێ ئه‌ی کۆمه‌ڵی بێ باوه‌ڕو وخوانه‌ناسان. من هه‌رگیز ئه‌و شتانه‌ی که ئێوه ده‌یپه‌رستن نایپه‌رستم چونکه من خواپه‌رستم وه ئێوه‌ش دیاره ئه‌وه‌ی من ده‌یپه‌رستم نایپرستن چونکه بت په‌رستن وه ئه‌وه‌ی ئێوه په‌رستووتانه من هیچ کات نایپه‌رستم وه ئێوه‌ش ئه‌و زاته‌ی من ده‌په‌رستم نایپه‌رستن که‌واته دینی خۆتان بۆ خۆتان ودینی خۆم بۆ خۆم ) ته‌فسیری ئاسان ل٦٠٣

وه جاری سێیەم گەورەی قورەیشان هاتنەلای ئەبوطالیب مامی وەباسی موحەممەدیان بۆی کرد وکەوا جوێن بەخواکانی ئەوان دەدات وە وامان پێ باشە گەنجێکی بەهێز وجوان بێنین بیکەنە کوڕی خۆت و واز لەم کوڕی برایەت بێنی ودەی کوژین ولەکۆڵمان دەبێتەوە وئیسراحەت دەکەین. وە ئەبو طالیبی مامی سەرسامی خۆی لەم گوفتاری ئەوان دەربڕی وفەرمووی ئەوە شتێکی دادپەروەر نی یە دەتانەوێ کوڕی خۆتان بدەن بەمن بۆتانی بەخێوبکەم وکوڕی برای خۆشم بدەمە دەست ئێوە بیکوژن چۆن دادپەروەریەکە ئەمە.

وە جاری تریش گەڕانەوە بۆ لای ئەبو طالیبی مامی بۆ ئەوەی وابکات کورە براکەی واز لەم دینە تازەیە بهێنێ واز لە جوێن دانی خواکانی ئەوان بهێنێ بۆیە ئەبو طالیبش وای پێ ڕاگەیاند پێغەمبەری خواش فەرمووی: بەچاوی پڕ فرمێسکەوە ئەی مامی خۆم سوێندم بەخوا ئەگەر بتوانن ڕۆژ بێننە لای ڕاستەم ومانگیش بخەنە لای چەپم بۆ ئەوەی وام لێ بکەن واز لەم ئاینە تازەیە بهێنم وازی لێ ناهێنم یان سەردەکەوم یان لەپێناویا سەر دەنێمەوە.

کە ئەبو طالیبی مامی گوێی لەم ووشانەی موحەممەد بوو ووتی: ئەی کوڕی برام دەبەردەوام بە لەسەر بانگەوازەکەت وە پێغەمبەری خوا بەردەوام بوو لەسەر بانگەوازەکەی وەمامی ئەبوطالیب وخەدیجەی خێزانی پاڵپشتی وکۆمەکی بوون لەگەڵ موسڵمانان

## هەڵسەنگاندن

٧ - عوتبەی کوڕی ڕەبیعە چی کرد کاتێ گوێ ی لەقورئان **بوو** لە پێغەمبەری خوا؟

٨ - چەماوە بکێشە بەدەوری وەڵامی ڕاست لەمانەی خوارەوە

**أ - بێ بڕوایان وویستیان ڕێکبکەون لەگەڵ پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی دووری کەنەوە بەسەر بانگەوازەکەی بەهۆی**

**(١) پێدانی ماڵ وسامان**

**(٢) پێدانی کلیلی کەعبە**

**(٣) چاوسۆرکردنەوە لێی**

**ب - پێشنیاری بێ بڕوایان بۆ پێغەمبەری خوا**

**(١) کەوا ڕۆژێ خوای ئەوان بپەرستێ ئەوانیش خوای ئەو بپەرستن.**

**(٢) واز لە خواپەرستی بهێنێ وە واز لەبت پەرستی بهێنێ.**

**(٣) خوا پەرستی وبت وسەنەم بپەرستێ**

**ج - بێ بڕوایان ویستیان ڕێک بکەون لەگەڵ ئەبو طالیبی مامی لەسەر ئەوەی**

**(١) ماڵ وسامانی پێ بدەن بەرامبەر تەسلیم کردنی پێغەمبەر بۆئەوەی بیکوژن.**

**(٢) بیکەنە گەورەی خۆیان بەرامبەر واز لێ بهێنێ لە بانگەوازەکەی**

**(٣) گەنجێکی بەهێز وجوان بدەن بە ئەبو طالیب بیکاتە کوڕی خۆی لەبەرامبەر ئەوەی موحەممەد بکوژن.**

**ئازاردانی بێ بڕوایان بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)**

لەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داواکاری گەورە گەورەی قورەیشیەکانی ڕەت کردەوە، بێ بڕواکان بڕیاری ئازاردانی موسلمانانیان دا، وەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تووشی چەندەها ئێش وئازار ونارەحەتی بوو لە دەست قورەیشیەکان لەوانە:

- ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا لەکەعبەدا پاش ئەوەی تەوافی کرد وپیاوێ هاتە لای بەجلەکانی خۆی لەملی پێغەمبەری ئالاند وویستی بیخنکێنێ وە بێ بڕواکان لەچواردەوری بوون وە ئەبو بەکری ڕاستگۆ هەڵسا وپەلاماری کابرای داو بەرگری لەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرد وفەرمووی ئایا پیاوێ دەکوژن کەدەڵێ خوا پەروەردگارمە؟ ئینجا وازیان لێ هێنا وڕۆیشتن

- ڕۆژێکی تر ئەبوجەهل لەنزیک کێوی (صەفا) گەیشتە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئازاری دا وجوێنی پێ دا ونەنگی پێ گرت وە ویستی لەشان وشەوکەتی پێغەمبەر محمد دابەزێنی بەقسەی ناشیرین وە پێغەمبەری خواش بێ دەنگ بوو، بەلام حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەر کە گوێی لەم قسانە بوو، چوەلای ئەبوجەهل وجوێنی پێ داوە لێی دا بەتیر وکەوان لەسەری ئەبوجەهل، وەپێی ووت ئایا چۆن جوێن بەکوڕی برای من دەدەی وەمنیش لەسەر ئاینی ئەوم وەبەم جۆرە تۆلەی

لەپێغەمبەر کردەوە وەبوەهۆی موسلمان بوونی حەمزەش (رضی الله عنه)

- وەرۆژێکیش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەنزیک کەعبەی پیرۆز نوێژی دەکرد ئەبو جەهل بەکۆمەڵێ بێ بڕوایانی ووت ئایا کەسێ نی یە بچێ بۆلای فلانە هۆز وپێستەی ووشتر بهێنێ کە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) چووە کرنوش بردن لە نوێژا بیخاتە سەر شانی پێغەمبەر وە پیاوێ کەناوی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط بوو هەڵسا چوو پێستەکەی هێنا وخستیە سەر شانی پێغەمبەر لەکاتی کرنوش بردندا وە ئەویش نەی توانی سەری بەرز بکاتەوە کەسیش هەڵنەستا لەسەر شانی لابات هەتاکو فاتیمەی کچی (رضی الله عنها) هات ودووری خستەوە وە شانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) و خاوێن کردەوە.

- وە لەو کەسانەی زۆر ئازاری پێغەمبەری خوایان دەدا مامی ئەبولەهەب وخێزانەکەی کەناوی ئوم جەمیل بوو وە ئەبولەهەب دراوسێی پێغەمبەر بوو (صلی الله علیه وسلم) وە زۆر جار پیسایی ودار وبەرد ودڕک وداڵ وزبلی دەخستە پێش دەرگای مالی پێغەمبەر،پێغەمبەر دووری دەخستەوە لەماڵەکەی خۆی وە دەیفەرموو: ئەی نەوەی عەبدمەناف ئێوە چۆن دراوسێیەکن وە ئوم جەمیلی خێزانیشی بەشداربوو لە کۆکردنەوەی دڕک وداڵ لەپێش مالی پێغەمبەر دای دەنا.



وە زۆر جاران جوێنی بەپێغەمبەر دەدا وقسەی ناشرینی پێ
دەووت وەلەم کاتە ئەم ئایەتانە دابەزی لەسەر پێغەمبەر دەرهەق
بە ئەبولەهەب و خێزانەکەی کە خوای گەورە دەفەرمووێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ
نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ
﴿٥﴾ سورە المسد ١-٥

واتە: (دەستەکانی بشکێ ئەبولەهەب وریسوابێت ئاشکرایە کەهەر ڕیسواش دەبێت ولەناودەچێت مال ودارایی وئەوشتانەی کەبەدەستی هێناوە فریای نەکەوت لەئایندەدا دەخرێتە ناو ئاگرێکی بلێسەدارەوە وە هەروەها ژنەکەشی کە هەمیشە هەلگری کۆلەدارە وئازاری پێغەمبەر دەدات هەمیشە گوریسێکی چنراو لەپوشی خورما لەگەردەنیەتی لەقیامەتیشدا زنجیری ئاسن دەکرێتە گەردەنی) تەفسیری ئاسان ل٦٠٣

**ئایادەزانی**:

سلی الجزور: (سلی) ئەو پەردەیەکە کۆرپەلەی ووشتری پێ دەورەدراوە

الجزور: ووشتری سەربراو

**ســـودێک**:

ئەبوجەهل ناوی: عەمری کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدوللای کوڕی مەخزوم وەنازناوی بە ئەبول حەکەم بوو

ئەبولەهەب ناوی: عەبدولعوزای کوڕی عەبدولموتەلیب کوڕی هیشام

## هەڵسەنگاندن

١. باسی ئەو ڕووداوە بکە کە ئەبوجەهل ئازاری پێغەمبەری **خوای** (صلی الله علیه وسلم) دا؟

٢. ئەبو لەهەب لەخزمایەتی چۆن بوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا **(صلی** الله علیه وسلم)؟

٣. ئەو کەسە کێ بوو پێستە ووشترەکەی لەسەر شانی پێغەمبەر **لابرد** وەکێش بوو خستیە سەر شانی؟

٣. باسی ئەو ڕووداوە بکە کە هەڵویستی حەمزە دیار **دەکات** لەئازاردانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؟

٤. ڕستەی گونجاوی (أ) بگەینە بەرستەی گونجاوی (ب) لەمانەی **خوارەوە**

| أ | ب |
|---|---|
| عوقبەی کوڕی ئەبو موعیط پێستەی ووشتری خستە سەر | سورەتی المسد بوو |
| ئەم ئایەتە دابەزی دەربارەی ئەبولەهەب وژنەکەی | بە دانانی بەرد ودڕک لەبەردەرگای ماڵی پێغەمبەر |
| بی بڕوایان وویستیان پێغەمبەری خوا بخنکێنن | لە نێوان شانی پێغەمبەردا |
| ئوم جەمیل ئازاری پێغەمبەری دەدا | ئەبو بەکر بەرگری لەپێغەمبەر کرد |

## وانەی شانزدەهەم

### ئازاری بێ بڕوایان بۆ بڕواداران (رضی الله عنهم)



هەر ئەم ئازاردانەی پێغەمبەر بەس نەبوو بەلکو ئازاردانەکە هاوەڵانی گرتەوە وەکەسیان لەهاوەڵان بەسەلامەتی قوتار نەبوون وەهەر هۆزێک هەڵسا بەئازاردانی رۆڵەکانی کە دەبونە ئیسلام بە بەندکردن وئازاردان ولێدان وقەدەغەکردنیان لە خۆراک وخواردنەوە وە دەیان خستنە سەر خۆڵ ولم بەبێ جل وبەرگ لەبەر هێزی گەرما بۆ ئەوەی لەم دینە تازەیە پەشیمانیان بکەنەوە وە نمونەش بۆ ئەمە زۆرن لەوانە:

**ئازاردانی خاوخێزانی یاسر (رضی الله عنهم)**

بێ بڕوایان هەڵسان بە ئازار وئەشکەنجەدانی هەندێک لە خاوخێزانی موسلمان بوەکان هەروەکو رویدا لەگەل خاوخێزانی یاسر، ئەوە عەماری کوڕی یاسر وەهەروەها باوکی ودایکی لەپێشینەکان بوون بۆ ئیسلام، بێ بڕواکان ئەوانەیان دەبردنە دەرەوەی مەککە ولەقرچەی گەرمای نیوەڕۆ ئازاریان دەدان بە ڕاکێشانیان لەسەر لم وچەوی گەرم بەرووتی، وەخواردن وخواردنەوەیان لێ قەدەغەدەکردن، وەجارێکیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەلایاندا تێ پەری وئازار دەدران پێیانی فەرموو: ئارام بگرن ئەی خاوخێزانی یاسر جێگای بەیەک گەیشتنمان لەگەل ئێوە بەهەشتە، وە یاسر لەبەر توندی ئازارەکە کۆچی کرد وسەری نایەوە وەبڕوای بەخواو پێغەمبەرەکەی بەهێزبوو وە سومەیەش بەرگری لەئەبو جەهل کرد وئەبوجەهلیش ڕمێکی لەسنگی داو شەهیدی کرد وبووە یەکەم شەهید لەپێناوی خوا وە ئازار وئەشکەنجەکە لەسەر عەممار زۆر توند بوو وەتوانی بەرگە بگرێ بەبڕوای بەهێزەوە،

**ئازاردانی بیلال** (رضی الله عنه):

ئومەیەی کوڕی خەلەف بێ بڕوا بوو زۆر ئازاری بیلالی دەدا، لەبەر گەرمای نیوەڕۆ جل وبەرگی لەبەر دادەکەند بەرووتی پشت وسنگی دەدا بەر بەردی گەرم وئازاری دەدا وفەرمانی دەکرد بەدانانی بەردی گەرمی سورکراوە ودەیخستە سەر سنگ وپشتی بیلال وپێی دەوت یان دەبێ پەشیمان بیتەوە یان هەتا دەمری لەسەر ئەم حالەتەدا دەبی یان بێ بڕوای خۆت نیشان بدەی بەموحەممەد، ولات وعوزا بپەرستی کە دوو بتی گەورەن کە عەرەبەکان دەیان پەرست لەپێش ئیسلام دا. وە بیلال (رضی الله عنه) ئارام گربوو لەسەر ئەم ووتەی یەکتاپەرستیە کە دەیفەرموو: أَحَدُ أَحَدُ... واتە: خوا تاک وتەنیایە، وە ئەبوبەکر بەلایدا تێپەڕی وڕۆژێ وەدیتی وا ئازار دەدرێ وە لەگەورەکەی کڕی لە پێناوی خوا ئازادی کرد.

وە نمونەی ئازار وئەشکەنجەی ئەبو جەهل ئەوە بوو کاتێ گوێی لێ با یەکێک ئیمان وبڕوای هێنابا وموسلمان بایە دەچووە لای وتەمبێی دەکرد وپێی دەووت ئایا وازت لە دینی باو باپیرانت هێناوە کە چاکترین ئاینە بۆت وە هەیان بوو لەبێ بڕوایان کاتێ چاویان بەیەکێ کەوتبا بڕوای هێنابا لێیان دەدا وبرسی وتێنویان دەکرد ماوەیەک هەتا وا بێهێز دەبوو نەی دەتوانی دابنیشێ لەبەر توندی ئەشکەنجەکەی.

وه یەکێک لەوانەی ئازار وئەشکەنجەی موسلمانانی دەدا ئەوەبوو کە کەنیزەکی خۆی ئازار دەدات تاکو وازبهێنێ لە ئیسلام وەتاوەکو ماندو دەبوو دوای وازی لێ دەهێنا پێی دەوت من بۆیە وازم لێهێنابووی لەبەر سۆز وبەزەیی نەبوو بەلکو ماندوبووم لەئازاردانت.

بەڕاستی دڵیان زۆر ڕەق وتوند بوو بەزەیی تیادا نەبوو چونکە موشریک وبێ بڕوابوون، ئەوا بەم جۆرە وایان دەکرد دوژمنانی ئیسلام وستەمکارانیش وە ئەم ئازار وئەشکەنجەی بێ بڕوایان بەرامبەر موسلمانان بەردەوام دەبێت لەهەموو کات وساتێک دا بۆپەشیمان کردنەوەی موسلمانان لە دینەکەیان هەرکاتێ هەلێکیان بۆ بڕەخسێ بەلام خەیالیان خاوە ئەم دینەی ئیسلامە بەکەس ناکوژێتەوە وەکو ئاگری بەربوو لەپوش وپەلاش وایە لەوشوێنە دەی کوژێنیەوە لەشوێنێکی تر سەرهەلدەداتەوە وبەهێزدەبێ.

**ئایا دەزانی:**

أَحَدُ أَحَدُ: ووشەیەکە مانای یەکتا پەرستی ونەهی کردن لەهاوەل بڕیاردان .
اعتقە: لەگەورەکەی کڕیەوە وئازادی کرد

## هەڵسەنگاندن

١ پێغەمبەری خوا کاتێ بەلای خاو خێزانی یاسردا تێپەڕی چی پێ ووتن؟

٢ باسی نمونەیەک لە نمونەکانی ئازاردانی بێ بڕوایان بۆ موسڵمانان، بکە؟

٣ چەماوە بکێشە بەرامبەر وەڵامی ڕاست لەمانەی خوارەوە

أ ـ یەک لەبێ بڕواکان ئازاری کەنیزەکی خۆی دەدا وکاتێ ماندوو دەبوو پێی دەوت:

١ ـ وازم لێ هێناوی لەبەر بەزیم بۆت.

٢ ـ وازم لێ هێناوی هەتا خواردن وخواردنەوە بنۆشی.

٣ ـ سوێند بەخوا وازم لێ هێناوی لەبەر بەزەیی نیە بەڵکو لەبەر ماندووبونمە لەئازاردانی تۆ.

ب ـ لەوکاتەی بێ بڕواکان ئازاری بیلالیان دا:

١ ـ ئارامی گرت و ووتی أَحَدُ أَحَدُ.

٢ ـ وازی لەئیسلام هێنا لەترسی ئازارەکە.

٣ ـ کۆچی کرد لە مەککە بۆ ناوچەی شام.

وانەی حەڤدەهەم

## نابلۆقەدانی موسڵمانان ودەنگ لێ بڕین



ئازاری بێ بڕوایان بەردەوام بوو لەسەر موسڵمانان بەچەندەها جۆر، وە کەقورەیش نەیان توانی موسڵمانان ساردکەنەوە لەسەر دینەکەیان وە کەزانیان ئەبو طالیبی مامی واز لە موحەممەدی برازای ناهێنێ وپشتی دەگرێ وەرازی نەبوو دەست بەرداری برازاکەی بێت، پەنایان بردە بەرشێوەیەکی تر لەئازاردانی پێغەمبەر وموسڵمانان ئەویش شێوەی پەیوەندی پچراندنی لەگەڵ پێغەمبەر وهاوەڵانی.

**پیلان لەسەر موسلمانان:**

گەورەکانی قورەیش کۆبونەوە رۆژێک وەراوێژیان کرد دەربارەی موسلمانان وەهاودەنگ بوون لەسەر پچڕانی پەیوەندی لەگەل پێغەمبەر وموسلمانان وئەوانەی یارمەتیان دەدەن لەنەوەی هاشیم وئەوانەی موسڵمانبوون لەوان تەنها مامی ئەبولەهەب نەبێ کە لەگەل بێ بڕوایان بوو وە پەیمانیان بەست موشریکەکان لەگەل یەکتر کە نەژن بدەن بە موسڵمانان ونەوەی هاشیم وەنە کڕین وفرۆشتنیان لەگەل بکەن وەنابێت کەس یارمەتی وخواردنیان بۆ بنێرێ وە کەس نابێت بەزەییان پێ دابێتەوە هەتا نەوەی هاشیم ملکەچی ئەوە دەبن کە موحەممەدی پێغەمبەری خوایان(صلی الله علیه وسلم) تەسلیم بکات وبیکوژن وە ئەم پەیمان نامەیان نوسی ولەناو کەعبە هەڵیان واسی.

**موسلمانان لە شیوەکە:**

قورەیشیەکان ئەم پەیمانەیان جێ بەجێ کرد بەووردی بەند بەبەند وە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وموسلمانان وهۆزی بەنو هاشیم ئابلۆقەدران لەشیوی ئەبو طالیب لە مەککەی پیرۆز، وە تووشی برسیێتی توند بوون بەهۆی ئەم دەنگ دابڕین وپچڕانی پەیوەندی لەسەریان هەتاکو ناچاری خواردنی گەڵای دار بوون لەبەر برسیێتی لەوکاتەی خواردنیان لێ بڕاو کۆتایی هات لەوکاتەی ئابلۆقەکە درێژەی کێشا وە بەهۆی قەدەغەکردنی کڕین وفرۆشتن لێیان، وە ئەم ئابلۆقەیە سێ سالی خایاند وە

بەلاو موسیبەت درێژەی کێشا لەسەر موسلمانان وە بازرگانان هەرکاتێ موسلمانێک شتێکی بکڕیبا ئەوان گرانیان دەکرد نرخی کالاو خواردەمەنی وە بەم جۆرە منالانی موسلمانان لە گریان دا بوون لەبەر نەبوونی خواردن لەبرسێتی.

**خوای گەورە فێلی ئەوانی هەڵوەشاندەوە**

خوای گەورە فەرمانی کردە مۆرانە کەوا پەڕاوی ئەم پەیمانە بخوات تەنها ووشە کە ناوی خوای لەسەر نوسرابوو مابۆوە نەی خوارد، وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاگاداری مامی خۆی ئەبوطالیب کرد لەم رووداوە ئەویش فەرمووی بەلێ، وەئەبوطالیب بەخۆی وبەکۆمەلێ لە پیاوان لە هۆزەکەی چوونە لای گەورەی قورەیشیەکان وە داوایان لێ کردن کە پەڕاوەکەی پێ نیشاندەن، ئەوانیش کە هێنایان دیتیان پەڕاوەکە مۆرانە خواردوویەتی تەنها ووشەی ناوی خوا نەبێت وە ئەبو طالیب پێیانی گوت برازای خۆم کە ڕاستگۆی دەست پاکە وای پێ ڕاگەیاندوم خوای گەورە مۆرانەی مل کەچ کردوە کە ئەم پەڕاوە بخوات ئەگەر ڕاست بوو ئەوا چاوێک بخشێننەوە بە پەیمانەکە وپەشیمان ببنەوە لێی، وەئەگەر ڕاست دەرنەچوو ئەوا موحەممەدتان دەدەمێ بیکوژن ئەوانیش ووتیان ئێمە رازین بەم قسەیە.

چاوەنواری هێنانی پەڕاوەکە بوون وەکە پەڕاوەکەیان کردەوە موحەممەد چۆنی باس کردبوو وادەرچوو وە بەم بۆنەیەوە موسلمانان (الله اکبر)یان کرد، وبێ بڕواکان زانیان ڕاستگۆیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ووتیان بەئەبوطالیب ئەوە لە جادوی برازاکەتە وەبەم موعجیزەی پێغەمبەرەوە تەنها دوژمنکاری وعینادیان بۆ زیاد بوو.

وە لە خەلکانی قورەیش کۆمەلێ لەژیران وعاقل مەندان ئەم موعجیزەی کە دیتیان سەرسام بوون وبۆیە پێنج لەوان بڕیاریان دا کە ئەم پەڕاوە هەڵبوەشێتەوە وکۆتایی بێت بەم ئابلۆقەداری وستەمکارانە وە چوون ئەم پەڕاوی پەیمان نامەیان پارچە پارچەکرد ودڕاندیان وە بوەهۆی دەروو لێ کردنەوە لە موسلمانان ونەمانی بەڵاو نەهامەتی وە دەرچوونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وموسلمانان لەم ئابلۆقەدا وبەسەربەرزی وسەرکەوتنی بانگەوازی ئاینی خوا.

**ئایا دەزانی:**

الشعب: **شیو لەنێوان دووکێودا**

الارضە: **گیانەوەری زەوی کە لە ناخی زەوی دەژی پێی دەوترێت (مۆرانە)**

## هەڵسەنگاندن

١ بێ بڕوایان پەیمانیان دا بەپچرانی پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەر وموسڵمانان هۆی چی بوو؟

٢ چەماوە بکێشە بۆ وەلامی ڕاست لەمانەی خوارەوە

أ - بێ بڕواكان ئابلۆقەی پێغەمبەری خوایان دا لەگەڵ ئەوانەی موسلمان بوون لە شێوی:

١ - ئەبو بەكر

٢ - ئەبوطاليب

٣ - ئومەیەی كوڕی خەلەف

ب - بێ بڕواكان ئابلۆقەی موسلمانان وپێغەمبەریان دا ماوەی:

١ - چوارساڵ

٢ - پێنج ساڵ

٣ - سێ ساڵ

٣ چۆن پەیمانەكە هەرەسی هێنا لەنێوان موسلمانان وبێ باوەڕان لەشێوی ئەبوطاليب؟

## سەبر وئارامی هاوەڵان لەسەر ئازاردان



سەبر وئارامی ڕەوشتی جوان ورێک وپێکە لەبەر ئەوەیە خوای بالادەست مەدح وستایشی ئارامگرانی کردوە لە چەندەها ئایەتی قورئانی پیرۆزدا وە مزگێنی بەهەشتی پێداون کەدەفەرمووێ:((وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ )) البقرە ١٥٥-١٥٦

واتە: مژدە بدە بەوکەسانەی خۆگر وئارامگرن.. کەئەوانەن هەرکاتێک تووشی بەڵاو ناخۆشیەک دەبن دەڵێن ئێمە موڵکی خواین وهەرچی هەمانە بەخششی خوایە، سەرئەنجامیش تەنها هەربۆلای ئەو زاتەیە گەڕانەوەمان.

تەفسیری ئاسان ل٢٤

**چەند وێنەیەك لە سەبرو ئارامی هاوەڵان (رضی الله عنه) :**

وەلەبەر ئەم هۆیە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئارامی گرت لەسەر ئازار وئەشکەنجەی قورەیشیان ،وەهاوەڵانی (ڕەزا ورەحمەتی خوایان لێ بێت) بەم جۆرە ئارامیان گرت لەو کاتەی تووشی ئەزیەت وئازار وئەشکەنجە ونانبڕین وپچراندنی پەیوەندی لەگەڵ قورەیش بوون

وە لەو ئارامگرانە هاوەلی بەرێزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خەبابی کوری ئەرەت بوو (رضی الله عنه) کە ئەویش نۆکەری ئافرەتێک بوو لەقورەیش کە ناوی ئوم ئەنمار بوو وەخەبابیش ئاسنگەر بوو وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)خۆشی دەویست هەتا پێش هاتنی وەحی وەلەو کاتەی وەحی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هات یەکسەر موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند وپێغەمبەری خوای خۆش ویست وبە پاک وخاوێنی ئیسلامی وەرگرت، وە لەوکاتەی گەورەکەی بەموسڵمان بوونی خەبابی زانی فەرمانی پێکرد بەوازهێنان لەئیسلام وگەڕانەوەی بۆ بت پەرستی وەئەگەر نا لەئایندەدا ئەزیەت وئەشکەنجەی دەدات بەئازارێکی وەها کەس بەرگەی نەگرێت بەڵام خەباب وەلامی بەردەوام بوو لەسەر خواپەرستی وئیش وکارەکەی خۆی گوێی نەدا بە هەڕەشەکانی وەلەم کاتەدا ئوم ئەنماریش بەقامچی

لێی دەداو بەئاگر داخی دەکرد وەئاسنی سورکراوەی دێنا لەسەر پشتی دا هێنا بۆپەشیمان بوونەوەی بەڵام ئەو هەربڕوای پتەو وبەتین دەبوو وە صەبر وئارامی زیاتر دەبوو لەسەر راستە شەقامی ئیسلام

وەئەوەبوو رۆژێک خەباب هاتەلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کە عەبایەکی لەبەردابوو لەپاڵ کەعبە دانیشتبوو، فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا بۆ دوعاناکەی بۆمان، پێغەمبەری خواش هەڵسا و دانیشت ودەم وچاوی سوور هەڵگەڕا وفەرمووی: کەسی وا هەبوو کە لەپێش ئێوە بە شانەی ئاسنی یان بەمشاری ئاسن لەت وپەتیان دەکرد وگۆشتیان لەئێسقانیان جیادەکردەوە دەیان کرد بەدوولەتەوە هەرگیز لەئاینەکەی پاشگەز نەدەبۆوە سوێندم بەخوا، خوای گەورە ئەو ئاینەی خۆی تەواو دەکات وسەری دەخا تاوای لێ دێت سوار ڕێ دەکەوێ لە صەنعا بۆ حەزرەموت ترسی ڕێگای نامێنێت تەنها لەخوا نەبێت وە گورگیش لەمەڕەکان دا.

- پرسیاریان لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس کرد ئایا بێ بڕواکان ئازاری هاوەڵانی پێغەمبەریان دا بەجۆرێک کە بەرگەی نەگرن تاوای لێ بێت هەندێکیان واز لە ئاین بهێنن؟ فەرمووی: بەڵێ وای لێ هاتبوو لە موسلمانانیان دەدا وبرسیان وتینویان دەکردن هەتا وای لێ هات بوو هەیان بوو نەی دەتوانی دابنیشێ لەبەرئازاری لاشەی

وای لێ هاتبوو ئاگایان لەخۆ نەمابوو پرسیاریان لێ دەکرد ئایا لات وعوزا خوایە دەی ووت بەلێ هەتا لەسزا دوورکەوێتەوەو واز لەئەشکەنجەی بهێنن وە دلیان پڕبوو لەئیمان وباوەڕ.

- وە لەوانەی ئازاردران بەدەستی بێ بڕواکان ناوی حەمامە بوو دایکی بیلالی کوڕی رەباح، وەعامیری کوڕی فوهەیرە تاوایان لێ هاتبوو پرسیاریان لێ دەکردن نەیان دەزانی وەڵامی بدەنەوە وەلەوانەش ئافرەتێک ناوی زەنیرە بووبێ بڕواکان زۆر ئەشکەنجەیان دا تاوەکو چاوی کوێر بوو بەڵام هەر ئیمان وبڕوای بەتین تربوو وەئەبوبەکریش سزادرا هەتا وای لێ هات وویستی کۆچ بکات بۆ حەبەشە بەڵام لەڕێگادا گەیشت بەپیاوێ لە گەورەکانی قورەیش گەڕاندیەوە پەنای دا وەهەروەها عومەری کوڕی خەططاب سزا وئازاردرا لەو ڕۆژەی کە موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد وەبێ بڕواکان هاتن لێیاندا وتاکو ماندوو بوون تاکو پیاوێ کە لە قورەیش هات لەبن دەستی ئەوانی دەرهێنا رزگاری کرد.

## هەڵسەنگاندن

١. ئەبوبەکری راستگۆ بۆ ویستی کۆچ بکات بۆ حەبەشە؟

٢. باسی وێنەیەک لە صەبر وئارامی هاوەڵان لەدەست بێ بڕواکان؟

٣. چی روویدا کاتی زەنیرە سزادرا؟

٤. رستەی(أ)بگەیەنە بەرستەی راستی(ب) لەوانەی خوارەوە:

| أ | ب |
|---|---|
| ئوم ئەنمار خەبابی ئازاردا بەئاگر | هەتا وای لێ هات بڵێ لات وعوزا خوایە |
| خەباب داوای لەپێغەمبەر کرد | هەتا نەی دەزانی چی دەڵێت |
| بێ بڕواکان ئەشکەنجەی موسڵمانانیان دا | بۆ ئەوەی وای لێبکەن واز لەئاین بهێنێ |
| عاسیری کوڕی فوهەیرە ئازار درا | کەوا دوعا بکات خوا سزایان لەسەر سوک بکات |

## کۆچ کردن بۆ حەبەشە



لەوکاتەی ئەشکەنجەزۆری بۆموسڵمانان هێناوزۆربەی هاوەڵان شکاتی حاڵی خۆیان لای پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کردپێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ترساڵەوەی کەپاشگەز ببنەوەوهەڵگەڕێنەوەلەئیسلام لەبەرتوندی ئازاروترساندن بۆیەپێی فەرموون: (ئەگەربێت وبچنەحەبەشەچونکەلەوێ پاشایەکی لێ یە کەس ستەم لەکەس ناکات لەلای ئەو هە تاکو خوای گەورە دەرووی خێروخۆشیمان لێ دەکاتەوە)

وەبەم بۆنەیەوەژمارییەکی زۆری هاوەڵان چوونە حەبەشە لەوانە: عوسمانی کوری عەفان وخێزانەکەی روقیەی کچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو وە زوبەیری کوری عەوامیش وهەندێکی تریش بەدوایان داکەوتن وە جەعفەری کوری ئەبوطالیب تاکو ژمارەیان گەیشتە هەشتاوسێ کەس بوون بەپیاو ئافرەتەوە هەیان بوو لەگەل خێزانەکەی وەهەیان بوو بەتەنیابوو.

**قوریشەکان راوە دوی موسلمانان دەنێن لەحەبەشە**

کەقورەیشەکان زانیان موسلمانان هەندێکیان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە بەسەلامەتی گەیشتن بەوێ گەورەی قورەیشیەکان کۆبونەوە وبریاریاندا دووپیاو بنێرن بۆ حەبەشەو لای(نەجاشی) (پاشای حەبەشە) بۆگەراندنەوەی موسڵمان لەگەڵ خۆیان بۆ مەککە وەئەوەبوو عەبدوڵڵای کوری ئەبی رەبیعە وعەمری کوری عاصیان نارد کە عەمر هێشتا موسڵمانان نەبوو بوو وە چەندەها دیاری بەنرخیان بۆ پاشاو دەست وپێوندەکانی پاشا هێنا لەگەڵ خۆیان.

وەعەبدوڵڵا وعەمر گەیشتنە حەبەشە وەبەپاشایان ووت ئەی پاشا ئەوە کۆمەڵی لەخزمانی هۆزی ئێمە وازیان لەئاینی باب وباپیرانیان هێناوە چوونەتە سەر ئاینی تازە وەنەهاتوونە سەر ئاینی ئێوە، هاتوونە شار و ووڵاتی ئێوە، وەهۆزەکەی ئێمەش ئێمەیان ناردووە بۆ گەراندنەوەی ئەوانە بۆ مەککە ودەرکردنیان لەلایەن خۆتانەوە.

نەجاشی بیری کردەوە لە داواکاری عەمر وهاوڕێکەی وە لەم کاتەدا قەشە وگاورەکان هاواریان بەسەر نەجاشی داکرد کە دەبێ ئەوانە لە وولاتی ئێمە دەرچن (مەبەستی موسڵمانەکانە) بەڵام نەجاشی بەدەست ئاماژەی کرد کە بێ دەنگ بن، لەپاشان بڕیاری دا بەئامادەبوونی موسڵمانان پرسیاری لێیان کرد تاکو ڕاستی ئەم ڕووداوە بزانێ.

ڕاستی سەرددکەوی:

لەوکاتەی موسلمانان هەستیان کرد بەهاتنی عەبدوڵڵا وعەمری کوڕی عاص وە ئەوان داواکاریان کرد بۆیان لەلای نەجاشی، کۆبونەوە وبیریان کردەوە کەچی بکەن باشە! چی بەپاشا بڵێن؟ هەندێکیان ووتیان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چی فێرکردووین وا دەڵێین وە کۆمەڵێکیان چوونە لای نەجاشی بەسەرۆکایەتی جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب

نەجاشی پێی ووتن: ئەو ئایینە چیە کەبڕواتان پێ هێناوە وجیاوازیتان کردوە لەنێوان ئاینی باب وباپیرانتان وە نەهاتوونە سەر دینی گاوران؟

جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب وەلامی دایەوە ووتی: ئەی پاشا ئێمە گەڵێکی نەزان ونەفام بووین بت پەرست بووین وە مردارەبومان دەخوارد وەبەردەوام بوو لە ژماردنی خوڕەوشتی نەفامی لەپاشان فەرمووی: خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆناردووین

کەبنەچە ونەسەبی دەزانین وەراستگۆ ودەست پاک بوو وەبانگی کردین بۆخواپەرستی ویەکتاپەرستی وازهێنان لە بت پەرستی وسەردانی خزم وخوێش بکەین وقەدەغەی دەکرد لەکوشتنی منالآنمان وکچانمان وە دەستی کرد بەژماردنی خورەوشتی چاک وپاک، نەجاشی گوێی لەوتەی جەعفەر بوو دەستی بەموسلمانانەوە گرت ورەتی کردەوە کە موسڵمانان تەسلیم بەنوێنەری قورەیش بکاتەوە وبەوەش نەوەستا لەوڵاتی خۆی دەری کردن وەموسڵمانانی ئەمین کرد لەسەر ومالّیان.

وە موسڵمانان کەیف خۆش بوون بەئەنجامی دانیشتنە سێ قۆلیەکەی نێوان قورەیش وموسلمانان ونەجاشی وە ئەوانیش گەڕانەوە مەککە بەسەرشۆڕی وداخزاوی وەهەم دیسان قورەیش بۆجاری دووەم نوێنەری خۆیان ناردەلای نەجاشی ئەمجارەیان چەند فێلێکیان هەبوو بۆ هێنانەوەی موسڵمانان وئەشکەنجەدانیان.

دامەزراوی [illegible] راستی [illegible]

عەمر ووتی: ئەی پاشا ئەوانەی موسلمانن ووتەی وادەڵێن دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم کە مرۆڤە وخوا نی یە بانگی بکە وگوێیان بۆ راگرە.

نەجاشی دیسان بانگی موسڵمانانی کردەوە دەربارەی ئەو قسانەی کە قورەیشیەکان کردویان وەموسڵمانەکانیش بە فێڵ وتەلەکەی عەمریان زانی وئەم جارەیان ترسیان لێ نیشت کە نەبادا نەجاشی

بیان داتە دەست قورەیشیەکان، بەڵام جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب وورەی موسڵمانانی بەرزکردەوە دڵنیای کردنەوە ویادی خوای بیرخستنەوە کە خوا لەگەڵیان دایە.

وە نەجاشی پرسیاریانی لێ کردن دەربارەی عیسای کوڕی مەریەم ودایکی، وەجەعفەریش هاتە پێش پاشا وئەو چەند ئایەتەی سەرەتای سورەتی (المریم) ی بۆخوێندنەوە.

نەجاشی لەودەمەدا گریا وقەشەکانیش گریان هەتاکو ریشیان تەڕبوو لەفرمێسک وەزانیان ئەمە ئاینی خوایە ولەگەڵ ئاینی عیسا لەیەک سەرچاوە هاتوون وە فەرمانی دا بەوەی موسڵمانان لێرە ئازادن وەتەسلیم ناکرێنەوە وە فەرمانی دەرکردنی وگەڕاندنەوەی دیاریەکانی دا وفەرمانی چاکەکردنی لەگەڵ موسلمانان دا.

بەم هۆیەوە موسلمانان ژیان لەحەبەشە بەئەمن وئاسایش وبەخۆشیەوە کەس نەی توانی دەستی خراپیان بۆ درێژبکات وە عەمر وعەبدوللا بەسەر شۆڕی گەڕانەوە بۆ مەککە.

وە لەپاش ماوەیەک دەنگۆیەک بلاوبۆوە کە خەلکی مەککە گشتیان موسلمان بوون، بەم هۆیەوە کۆمەلێ لەهاوەلان گەڕانەوە بۆ مەککە لەوانە عوسمانی کوڕی عەففان وخێزانەکەی وئەبوسەلەمە وخێزانەکەی وە هەندێکی تریش وەئەوانەش جێگیربوون لەپاش گەڕانەوەیان لەمەککە تائەو کاتەی کۆچیان کرد بۆ مەدینەی پیرۆز وە ئەوانی تر لەحەبەشە مانەوە تا کاتی رزگارکردنی خەیبەر.

**سودێک:**

گەڕانەوەی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب بۆ مەدینە لەوڕۆژە بوو کەموسڵمانان خوای گەورە سەرکەوتنیان پێ بەخشی بوو بەسەر جوڵەکەی خەیبەر وە قەلای خەیبەریان فەتح وئازاد کرد، وە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: نازانم بەکامیان دڵ خۆشبم بەئازادکردنی خەیبەر یان بەهاتنەوەی جەعفەر.

**ڕاهێنان:**

فەرمان بەقوتابیەک بکەن بەخوێندنەوەی سەرەتای سورەتی (مەریەم)

**ئایا دەزانی:**

البطاريقه: کۆی بطريق/ سەرۆکی قەشەکانی وسەرۆکی سەرکردەکانی ڕۆم.

## هەڵسەنگاندن

١. هۆی چی بوو موسڵمانان هاندران بۆ کۆچکردنیان بۆ حەبەشە؟

٢. بۆچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەبەشەی هەڵبژارد بۆ کۆچکردنی موسڵمانان بۆی؟

٣. نیشانەی( ✔ ) بەرامبەر رستەی راست ونیشانەی(×) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ

أ ـ نەجاشی رازی بوولەسەر ناردنەوەی موسڵمانان لەگەڵ دوو پیاوەکەی قورەیش.

ب ـ عوسمانی کوڕی عەففان وەڵامی پسیاری نەجاشی داوە.

ج ـ لەوکاتەی نەجاشی زانی کە ئەوبێ بڕوایانەی مەککە بۆچی هاتوون دیاریەکانی رەت کردەوە لەووڵاتی خۆی دەری کردن.

وانەی بیستەم

## ساڵی غەم وماتەمی (عام الحزن)



ئەبوطالیب لەپاڵ پشتی برازای دابوو یارمەتی دەدا وپاراستی لەدەست قورەیشیەکان تا نەیکوژن لەگەڵ ئەم هەموو نەهامەتیەی کەهاتبووە سەریان بەڵام بڕواشی پێ نەهێنا .

رۆژان رۆیشتن وە ئەبوطالیبیش لەنەخۆشی مەرگ نزیک بویەوە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) سەردانی دەکرد وئیسلامی لەلای خۆشەویست دەکرد تاکو بروابهێنێ، وە ئەبوجەهلیش وەستابوو لەلای لەئیسلامی دووردەخستەوە وە ئەبوطالیب گیانی سپارد ولەم نەخۆشیەی هەڵنەستایەوە.

پاش شەش مانگ لەمردنی ئەبوطالیب دایکی ئیمانداران خەدیجەی کچی خوەیلید (رضی الله عنها) خێزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو ئافرەتە بەرێزە صالیحە ومل کەچ بۆخوا کۆچی دوایی کرد کە پێغەمبەری خوا مژدەی خانووی پێدابوو لەبەهەشت، چونکە یەکەم کەس بوو کەبڕوای هێنا لەئافرەتان وەباری بانگەواز و وەحی خوای لەسەر سوک کرد وەبوە پاڵپشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوئازار ونارەحەتیەی کە هاتەرێی بانگەوازەکەی وەلەسەرەتای دابەزینی وەحی دڵنەوای پێغەمبەری کرد کاتێ لەغاری حیرا هاتەوە پێی فەرموو سوێندم بەخوا خوای گەورە قەت سەرشۆڕت ناکات چونکە تۆ سەردانی خزم وکەس دەکەیت وباری بارقورسان سووک دەکەی میوانداری دەکەیت ویارمەتی بێ نەوایان دەدەی وە هەڵسا موحەممەدی بردەلای کوڕی مامی خۆی وەرەقەی کوڕی نەوفل وەپیاوێکی پیربوو ببوە گاور

وەئەویش دڵنەوای پێغەمبەری کرد پێی ووت: ئەوە وەحی خوایە خوای گەورە بەجوبرائیل دەینێرێ بۆ پێغەمبەران.

وە خەدیجە وەستا لەگەڵ پێغەمبەر بە خۆی وماڵ وسامانی وبڕوا وئیمانەکەی بووە پاڵپشت بۆ ئیسلام وبانگەوازەکەی وە بووە هێزێکی لەبن نەهاتوو بۆ ئیسلام وە پێغەمبەری خوا بەمردنی خەدیجە خەمناک بوو وەهەروەها بۆ مردنی مامی ئەبو طالیب خەمناک بوو کە هەردووکیان پالپشتی ئەو بوون.

وە لەوکاتەی مامی وخەدیجە کۆچیان کرد قورەیشیەکان هەڵیان بۆرەخسا بۆ زیاتر ئازاردانی پێغەمبەر، وە قورەیشیەکان دەرگای بانگەوازی ئیسلامیان داخست وپێغەمبەریش زۆر خەمناک بوو وەپاش مردنی ئەو دووانە بەیانیان وئێواران بانگی خەلکی دەکرد بۆ ئیسلام بەلام کەس بەدەم بانگەوازەکەی نەدەهاتن وەهەموو ڕۆژێک دووبارەی دەکردەوە.

**ڕاهێنان:**

**لەدەفتەرەکەت دا ئەو ووتەی خەدیجە بنوسەوە کە پاش گەڕانەوەی پێغەمبەر لە ئەشکەوتی حیرا پێی ووت.**

**ئایا دەزانی :**

تحمل الكل: **هەلگرتنی کەل وپەلی هەژاران وبێ نەوایان.**

تكسب المعدوم: **نان دەدەی بەو هەژارانەی کە سامانیان نی یە**

تقرى الضيف: **ڕێزی میوان دەگری خواردنیان دەدەیتێ.**

تعين على نوائب الحق: **یارمەتی بێ نەوایان دەدەی**

**هەڵسەنگاندن**

١ خەدیجە چی بەپێغەمبەر ووت لەوکاتەی وەحی دابەزی **بۆی؟**

٢ خەدیجە بەچ شتێک یارمەتی پێغەمبەری خوای دا؟

٣ هەر رستەیەک لەکۆمەلی ( أ ) بگەینە بەرستەی کۆمەلی ( ب ) لەمانەی خوارەوە

| ( أ ) | ( ب ) |
| --- | --- |
| ئەو ساڵەی ئەبو طالیب و خەدیجە کۆچیان کرد دەوترێت | ئازارو ئەشکەنجەی کافران زیاد بوو بۆ سەر پێغەمبەر |
| پاش کۆچی خەدیجەو ئەبو طالیب | لە یارمەتی پێغەمبەری خوا |
| پاش کۆچی خەدیجە و ئەبو طالیب | ساڵی غەم |
| قورەیش ویستیان چاک دابدەن بە ئەبو طالیب | لە پاڵپشتی پێغەمبەر دابوون |

## ڕۆیشتنی پێغەمبەر بۆ طائیف



قورەیشیەکان هەموو دەرگاکانیان گرت بەڕووی بانگەوازی ئیسلامی دا وە پێغەمبەر خوا (صلی الله علیەوسلم) ئازار وئەشکەنجە ونارەحەتی چەشت پاش مردنی ئەبوطالیبی مامی وخەدیجەی خێزانی (رضی الله عنها) وە بۆپەرەسەندنی بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا بەرەو طائیف بەرێ کەوت تاکو بەئومێدی پەیداکردنی پەناگەیەک بۆ بلاوبونەوەی بانگەوازی ئیسلامی تیادا.

**پێغەمبەر بانگی خەلکی طائیف دەکات:**

پێغەمبەری خوا لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریسە گەیشتنە طائیف وبینیان کۆمەڵێ لە هۆزی سەقیف دانیشتوون وەلەگەل گەورەکانی سەقیف بوون وە پێغەمبەری خوا پاش سلاوکردن دانیشت لەلایان وبانگی کردن بۆ ئیسلام وە داوای یارمەتی لێ کردن کەسەری بخەن بەسەر ئەوانەی بەدرۆی دەخەنەوە وەئەوانیش نەک هەرگوێیان پێ نەدا بەلکو ئازاریان داو منالە ووردکە وبێ ڕێزەکانی خۆیانیان لێ هاندان وبەرد بارانیان کردن وبەشەڕە جوێن وشەڕە بەرد شاربەدەریان کردن هەتا قاچی پیرۆزی خوێنی لێ دەتکا وەناچاربوون لایان دا بۆ لای باغ ورەزی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی قورەیش.

**پەنابردن بۆ خوا لەکاتی تەنگانەدا:**

لەناو باغ ورەزەکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دانیشت لەژێر سێبەری دارمێوێک وە لەپاش ئەوەی کەمێک حەسانەوە دەستی هەڵبڕی بۆ ئاسمان فەرمووی: (**اللَّهمَ اِلیكَ أشكو ضعفُ قُوتي و قلةَ حيلتي وهَواني على النَّاسِ، يا ارَحَم الراحمين انت رَب المستضعفين وانت ربي...** تاکۆتایی دوعا ونزاکەی) وەڕاڤەکەی بەم جۆرەیە(ئەی خوایە لاوازی هێز وتوانایی وبێ دەسەلاتیم بەدەست خەلکەوە بۆلای تۆ دەهێنم، ئەی بەبەزەیترینی هەموو بەبەزەیەکان تۆ پەروەردگاری ژێر دەستەکانی، خاوەنی منی،

بەکێم دەسپێری؟ بەدوورە کەسێک ئازارم بدات؟ یان بەدوژمنێک کارت داوەتەدەست؟ ئەگەر تۆ تورە نەبیت من باکم نیە، بەڵام بێ وەیی کردنی تۆ بۆ من دڵەگوشادترە، پەنا دەگرم بەنووری رووی پیرۆزی تۆ کە هەموو تاریکستانەکانی ڕووناک کردۆتەوە، کاروباری دونیا وئاخیرەتی لەسەر دامەزراوە لەوەی تووورەیی تۆم بەسەر دابباریێت، یان خەشمت بم گریێت، راز ونیاز هەربۆلای تۆیە هەتا رازی دەبیت وە (لاحول ولا قوه الا بک) (گولاوی سەرمۆر ل١٤٨) ) زۆر پاڕایەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وە زۆر ئارامی گرت لەسەر ناخۆشیەکان وبەردەوام بوو لەسەر بانگەوازی ئیسلام هەرچەند تەگەرە وکۆسپی هاتبا پێشەوە.

لەوکاتەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە بن ئەو دارە دانیشتبوو پاڕانەوەی لەخوا دەکرد، کوڕەکانی رەبیعە خاوەنی رەزەکە لەلایەکی رەزەکە خۆیان حەشار دابوو چاویان بەموحەممەد کەوت بەم شێوە سۆز ورەحمیان بۆلای جولا لەبەر نزیک بونەوەیان بەهۆز ونەسەبی پێغەمبەر وخزمایەتی، غولامێکی خۆیان کە گاور بوو ناوی عەدداس بوو نارد بە هێشووەک ترێ بۆلای پێغەمبەر وپێیان ووت بلێ ئەم هێشووە ترێ یە بخوات وەکە پێغەمبەری خوا دەستی بۆ برد فەرمووی:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

عەدداس کە گوێی لەم ووتەیە بوو بەسەرسورمانێکەوە کە قەت ووتەی وای گوێ لێ نەبوو بوو لەپێش دا لەووڵاتی عەرەب دا لەپاشان ووتی سوێندم بەخوا ئەم ووشەیە خەڵکی ئەم ووڵاتە نایڵێن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: تۆ خەلکی کام وولاتی وەئاینیشت چی یە؟ ئەویش ووتی من خەلکی نەینەوام (موسلی ئێستا)پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەو شارەی کە یونسی کوڕی مەتیَ ی لێیە؟
عەدداس ووتی: تۆ یونسی کوڕی مەتیَ چۆن دەناسی؟

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەو یونسە برامە وپێغەمبەر بوو منیش پێغەمبەرم، وەلەم کاتەدا عەدداس هەڵسا وسەر ودەست وپێی پێغەمبەری ماچ کرد وموسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند وەکوڕانی رەبیعەش ئەم ڕووداوەیان بە بەرچاوە وەبوو تەماشایان دەکرد ووردبوونەوە لێیان وەزۆر غەمبار بوون وسەریان سورما لەوکارەی عەدداس کردی وئەم موسڵمان بوونی عەدداسەش بووە سێبوری لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەکەی وە زیندوو بوونەوەش بوو بۆ وورەی پێغەمبەر تاکو بەردەوام بێت تووشی بێتاقەتی نەبێت.

### لەگەڵ فریشتەی کێوەکان

پێغەمبەری خوا گەڕایەوە لە طائیف بە خەم وخەفەتەوە بەهۆی ئەو نارەحەتیەی کەتووشی هات لەدەست خەلکی طائیف وە وەلام نەدانەوەی خەلکی طائیف هەتا گەیشتە نیوەی ڕێگا لەم کاتەدا پارچە هەورێک سێبەری لێ دەکرد کەسەری بەرزکردەوە تەماشای کرد جوبرائیل بوو (علیه السلام) لەگەل فریشتەی کێوەکان خوای گەورە ناردبووی بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی فەرمان بکات بە لێک دانی دوو کێوەکەی نێوان طائیف ولەناوبردنی خەڵکی بێ بڕوای طائیف، بەلام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەخێرهاتنی لە جوبرائیل وفریشتەی کێوەکان کرد وڕازی نەبوو ئەو کێوە بدەن لەیەک وبەسەر خەلکی طائیف دابڕوخێنن فەرمووی: ئومێدم وایە خوای گەورە لەنەوەی ئەوانە خەلکانێ دروست بکات کە خوابپەرستن وهاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن

تەماشای پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) بکەن چەندە ڕەحمەت وسۆزی هەیە بەرامبەر ئەو گەلەی کە ئازار ونارەحەتی دەدەن وئەویش ڕەتی دەکاتەوە کە لەناو بچن.

وە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەشاری مەککە نزیک کەوتەوە هەڵسا نوێژی کرد لەشەودا وە لەوکاتەی لەراوەستان دابوو لە نوێژا، خوای گەورە کۆمەڵێ لە جنۆکەی نارد کە گوێ لەقورئان رابگرن وەبەم هۆیەوە بڕوایان هێنا وگەڕانەوە بۆلای گەلەکەی خۆیان وە بۆ بانگەوازی کردنی گەلەکەیان بۆ ئیسلام بوون وە ئەم ڕووداوەش بووە هۆی بەهێزبوونی وپالپشتی کردنی پێغەمبەری خوا ودڵ ئارام بوونی.

ئایا دەزانی:

ئەگەر موسلمانێ خواردنی خوارد دەبێ ناوی خوا بهێنێ وبەدەستی راستی بخوات.

سودێک:

١ ـ بەخورەوشتی ئیسلامییە فەرمان بەرێتی سونەتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هۆیەکە بۆ موسلمان بوونی خەلکان.

٢ ـ جنۆکە دروستکراوێکن لەدروستکراوەکانی خوا، هەیانە موسڵمانە وهەیانە بێ بڕوایە بەئاینی خوا.

## هەڵسەنگاندن

١. هۆی چی بوو پێغەمبەری خوا چووە طائیف.

٢. هەڵویستی گەورە گەورەکانی سەقیف چی بوو لەبانگەوازەکەی پێغەمبەر؟

٣. بۆ کوێ چوون وپەنای دا لەکاتی منالە ووردەکەی **طائیف** ئازاریان دا ؟

٤. پێغەمبەری خوا چی کرد لەوکاتەی حەسایەوە لەژێر درەختەکە؟

٥. نیشانەی( ✔ ) بەرامبەر رستەی راست ونیشانەی(✗) به**رامبەر** رستەی چەوت دابنێ

**( أ ) ئەو پیاوەی هێشووە ترێکەی بۆپێغەمبەربرد ناوی**

**○ سەلمان ○ بیلال ○ عەدداس**

**( ب ) ئەو پیاوەش خەلکی شاری**

**○ قودس ○ دیمەشق ○ نەینەوا**

**( ج ) لەو کاتەی پێغەمبەری خوا لە طائیف گەڕایەوە نوێژی دەکرد شەوێ خوای گەورە کۆمەلی بۆناردن**

**○ کۆمەلێ لە عەرەب ○ کۆمەلێ لە جنۆکە ○ کۆمەلێ لە فریشتەکان**

## وانەی بیست و دووەم

### شەو ڕەوی وبڵند بوونەوە

پێغەمبەری خوا تووشی چەندەها تەنگ وچەڵەمەبوو لەدەست بێ بڕوایانی قوڕەیش و دەواین کارەسات ئەوەبوو لەپاش گەڕانەوەی لە طائیف هەموو دەرگاکانی بڵاوبونەوەی بانگەوازی ئیسلامیان لەسەرداخست تاخوا دەرووی خێری لێ کردەوە کەس نەهاتە نێوئلینیئسلام




شبه الجزيرة العربية وبلاد الشام وتظهر المسافة التي بين مكة المكرمة ومدينة القدس

### شەو ڕەوی (الاسراء)

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بیری لەبانگەوازی ئیسلامی دەکردەوە بیری لەو هەڵویستەی قورەیش دەکردەوە کە ڕێگربوونە لە بڵاوبوونەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەتا ئەوکاتەی جوبرائیل (علیه السلام) لەگەڵ بوراق کە وولاخێکە جولانەوەی زۆر بەخێرایە وە ئەوەندە گەورە نیە وبچوکیش نی یە پێغەمبەری خوا سواری پشتی بوو شەوڕەوی پێ کرد لە مزگەوتی حەرام کە مەککەیە بۆ مزگەوتی ئەقسا لەشاری قودس (کەلەفەلەستینی ئەمرۆ داگیرکراوە) وەلەوێ دا خوای گەورە روحی هەموو پێغەمبەرانی کۆکردەوە، وپێغەمبەرمان موحەمەد بەرنوێژی دوو ڕەکعەتی بە ئیمامەتی بۆ کردن لەوێ دا لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە پێغەمبەری خوا سەرقافلەی پێغەمبەرانە وهەموو ئاینێک دەبێ سەرنەوی کات بۆئاینی پیرۆزی ئیسلام.

### بلندبوونەوە (المعراج)

وە لەمزگەوتی ئەقسا لەقودس جوبرائیل پێغەمبەری خوای لەگەڵ خۆی بەرزکردەوە وبۆ ئاسمانی دونیا لەپاشان بۆ هەموو ئاسمانە بەرزەکان وە جوبرائیل بۆ هەر ئاسمانی داوای ئیزنی دەکرد بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوانیش دەیان ووت کێ لەدەرگایە دەی فەرموو جوبرائیلە، دەیان ووت کێت لەگەڵە دەی

فەرموو موحەممەد ئەوانیش دەیان فەرموو: ناردویانە بەدوای دا فەرمووی بەڵێ ئەوانیش دەیان ووت بەخێربێیتەوە وەهەروەها هەموو دەرگاکانی ئاسمانی بەم شێوەیە بۆی کراوە لەپاشان ئاسمان بەئاسمان بەسەرکەوت هەموو پێغەمبەران وفریشتەکانی خوا سەلامیان لێ کرد

**فەرز بوونی نوێژ:**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)گەیشت بەکۆمەڵێ لەپێغەمبەران لەوانە ئادەم وعیسا وموسا سەلامی خوایان لێ بێت لەپاشان بەسەرکەوت تا گەیشتە ئەو دارەی کەپێی دەڵێن (سیدرەئەلمونتەها) لەوێ دا جوبرائیل نەی توانی بە سەربکەوێ وەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆی سەرکەوتو نزیک کەوتەوە لە خودای بانی سەر وەگفت وگۆی لەگەڵ خودا دا کرد خوای گەورەش پێنج نوێژی فەرزکرد لەسەرخۆی وئوممەتی لەبنەڕەتدا پەنجا نوێژە لەپاشان خوا بۆی سووک کرد تا گەیشتە پێنج نوێژ لە شەو ورۆژدا کەئەویش بەزەیی خوابوو بۆی لەپاشان پێغەمبەری خوا دابەزی بۆ قودس وسواری بوراق بۆ بوو وەگەرایەوە بۆشاری مەککەی پیرۆز لەکاتی نوێژی بەیانی دا وە لەڕێگادا چاوی بەکاروانی قورەیشیان کەوت وئەوانیش ووشترێکیان لێ بزربوو پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) ئاماژەی کرد کە لە فلانە جێگادایە.

گەڕایەوە پێغەمبەری خوا بۆمەککە وکەیف خۆش بوو وەهێزی جار لەدواجار زیادبوو وەدەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرایەوە وکەواتە ئەی موحەمەد خەمبار ودڵتەنگ مەبە ئەگەر خەڵکی سەرزەوی بانگەوازەکەت رەت دەکەنەوە واخەلکی ئاسمان وئاسمانەکان پیرۆزبای وبەخێرهاتنت دەکەن.

پێغەمبەری خوا

پێغەمبەری خوا بۆ خەلکی مەککەی باس کرد چیرۆکی ئیسرا میعراجی خوای گەورە وەخەڵکانیش لەنێوان راستو ناراستو دانان وبەدرۆ و دانان دابوون،وە بێ بڕواکان وویستیان ئەم رووداوە بکەنە هەڵێک بۆ ڕێگربوون وپەشیمان بوونەوەی موسلمانە تازە بروادارەکان لەئیسلام وەکۆمەڵێ کەم بروانزمەکان پەشیمان بوونەوە ولەئیسلام دەرچوون وکۆمەلی تر بڕوایان پتەوتربوو لەسەر ئیسلام دا وەلەوانە ئەبوبەکری راستگۆ (رضی الله عنها) کەئەم روداوەی بەڕاستگۆ لەقەلەم داوە وەلەم رۆژەوە ناونرا بەئەبوبەکری صدیق واتە (ڕاستگۆ) وەقوڕەیشیەکان هاتن وپرسیاریان لەپێغەمبەر دەکرد دەربارەی وەسفی قودس ومزگەوتەکەی وەپێغەمبەری خواش وەلامی پرسیاری ئەوانی دەدایەوەوخوای گەورە وێنە ورەسمی مزگەوتی قودسی هێنایە پێش چاوی، هەروەکو وا وێنەی قودس لەپێش دانراوە لەپاشان

رای گەیاند شوێنی کاروانەکەیان لەشام وەدەربارەی ئەو ووشترە کەبزریان کردبوو کەوا لەکوێ بوو وەلەگەڵ ئەم هەموو بەڵگە ونیشانانەی پێغەمبەر، گەورەگەورەکانی قورەیش کافرتر وبەفیز وخۆبەگەورەزانتر دەبوون.

البراق: ئاژەڵێکە وەکو ئەسپ وایە رۆیشتنی خێرایە وپێ یەکانی لەوشوێنەی کەچاو دەیگاتێ دادەنێ.

## هەڵسەنگاندن

١ ئەم بۆشاییانەی خوارەوە پڕبکەوە:

○ ئەو وولاخەکەی پێغەمبەری خوا سواری بوو لەشەوی ئیسرا ومیعراج داناوی.....................................................

○ پێغەمبەری خوا شەوڕەوی پێ کرا بۆمزگەوتی قودس لەمزگەوتی.....................بوو

○ هاوەڵێتی پێغەمبەری کرد لەسەفەری شەوڕەوی وبلند بوونەوەی دا.....................

○ پێغەمبەری خوا بەرزبۆوە بۆ ئاسمانەکان لەمزگەوتی.............

○ جوبرائیل پێغەمبەری جێ هێشت لەنزیک..............

○ خوای گەورە پێنج نوێژی فەرزی لەشەو ڕۆژێک دا فەرز کرد کە لەبنەرەت دا ژمارەی.........نوێژ بوو.

○ ئەبوبەکر بەراستی داناو کە ئەو دەنگ وباسی ئیسراومیعراجی گوێ لێ بوو ناوی لێ نرا..........

٢ هەڵوێستی قورەیش چۆن بوو لەوکاتەی دەنگ وباسی ئیسرا ومیعراج بڵاوبووە

٣ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چی دیت لەرێگای گەڕانەوەی لە قودسەوە بۆ مەککەی پیرۆز؟

**مەشق کردن:**

خوێندنەوەی دە ئایەتی سورەتی ئیسرا

وانەی بیست وسێ

## پەیمانی عەقەبەی یەکەم



پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بانگی هۆزە عەرەبەکانی دەکرد بۆ بڕواهێنان وموسڵمان بوون لەوکاتەی کەدەهاتنە مەککە لەوەرزی حەج دا پێی دەفەرموون ئایا کەسێکتان تێدایە کە من بباتەوە بۆ نێو هۆزەکەی وپارێزگارم بکات تا پەیامی خوا بگەیەنم، چونکە قورەیشیەکان ڕێگریان لێم کردوە لەگەیاندن وبلاوکردنەوەی پەیامی خوا (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بێ ئومێد نەدەبوو وەرانەدەوەستا لەگەیاندنی بانگەوازەکەی.

**یەکەم گەیشتن بە خەلکی مەدینەدا:**

لە شوێنێک کە پێی دەوترێت (عەقەبە) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)  گەیشت بە شەش کەس لەپیاوانی مەدینە وەچووەلایان وپرسیاری لێ کردن، ئێوە کێن ووتیان کۆمەڵێکین لەهۆزی خەزرەج، فەرمووی ئایا ئیزنم دەدەن لەگەڵتان دانیشم گفت وگۆتان لەگەل بکەم، ئەوانیش ووتیان بەڵێ فەرموو: ئەویش پێی راگەیاندن کەوا پێغەمبەری خوایە وئاینی ئیسلامی پێ راگەیاندن وقورئانی پیرۆزی بەسەردا خوێندنەوە وئەوانیش تەماشای لای راست وچەپیان کرد وتەماشای یەکتریان کرد وەدڵیان هاتە لەرزە ئەوە ئەو پێغەمبەرەیەکەوا  جولەکەکان ئەوانیان پێ دەترساند کەجولەکەکان دەیان ووت سات وچەرخێک نزیک بووە کەپێغەمبەرێک پەیدا ببێ وەلەئێمەیە وبەهۆی ئەوەوە بەسەرتان زال دەبین وشەڕتان لەگەڵ دەکەین.

ووتیان ئەی گەلی خزمەکان، سوێند بەخوا ئەوە ئەو پێغەمبەرەیەکە جوولەکەکان ئێمەیان پێ دەترساند، وەرن با پێش ئەوان بڕوای پێ بهێنین وموسلمان بین وەئەوانیش وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) داوە وموسلمان بوون لەپاشان ووتیان بەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئێمە گەڵەکەی خۆمان جێهێشتووە لەمەدینە ولەشەڕداین لەگەل هۆزەکەی تر وە جولەکەکان بوونەمایەی نانەوەی فیتنە وئاشوب لەنێوانمان دا ئومێدمان وایە خوا بەسایەی تۆوە نێوان ئەم دوو هۆزە یەک بخاتەوە.

وه ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ ناو خزم وکەسەکەمان وبانگیان دەکەین بۆ ئیسلام، ئەگەر وەلامیان دایەوە ئەوا ئێمە دەبینە پالپشت بۆ تۆو ئاینەکەی تۆ لەپاشان پاش تەواو بوونی وەرزی حەج گەڕانەوە بۆ مەدینە بۆلای هۆزەکەیان ومزگێنی یان دا بەهۆزەکەیان بەهاتنی پێغەمبەر وە بەهۆی ئەمەوە کۆمەلێکی تر لەهۆزی ئەوس وخەزرەج موسلمان بوون.

**گەیشتنی دووەم (پەیمانی عەقەبە):**

لەوەرزی حەجی سالی داهاتوودا دوانزە کەس لەهۆزی ئەوس وخەزرەج هاتن بۆ مەککەی پیرۆز پێنج کەسیان لەوانەبوون کەسالی پار بەخزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەیشتن، وە ئەوا دوانزە کەسەکە هاتنەلای پێغەمبەر وپەیمانیان دایێ لەسەر ئەوەی شەریک وهاوەل بۆ خوا بڕیار نەدەن ودزی وداوێن پیسی نەکەن ومنالی خۆیان زیندەبەچال نەکەن وەدرۆنەکەن وەکە چاکەیان بەرامبەرکردن بەخراپە وەلامی نەدەنەوە وەپێغەمبەری خواش مزگێنی بەهەشتی پێ دان ئەگەر ئەوانە جێ بەجێ بکەن لەپاش تەواو بوونی وەرزی حەج گەڕانەوە بۆمەدینە وپێغەمبەری خوا موصعەبی کوڕی عومەیری لەگەلدا ناردن بۆ فێرکردنی ئاینی ئیسلام وبنەما سەرەکیەکانی ئاین وەئاینی ئیسلام بلاوکاتەوە لە مەدینە.

ئایا دەزانی:

موسم الحج: ئەو حەجەبوو کە لەنەفامی دەیان کرد ودەهاتنە مالی خوا بەلام زۆر هەلە وشتی خراپی تێدا ئەنجام دەدرا وەهەندێکی لەپاشماوەی ئاینی ئیبراهیم مابوو.

یثرب:

ناوێکە بۆ شاری مەدینە ولەپێش کۆچی پێغەمبەر بۆ ئەوێ ناوی یەسرب بوو بەلام پاش کۆچ کردن ناوی گۆڕا بۆ مەدینەی منەوەرە یان تەیبە وطابە.

العقبە: شوێنێکە نزیک مینا لەرۆژانی چەژنی قوربان لەوەرزی حەج خەلکی بەردی تێ دەهاوێ.

سودێک:

مەرجەکانی پەیمان وبەیعەت وەرگرتن

١ ـ هاوەڵ وشەریک بۆخوا بڕیار نەدەن

٢ ـ دزی نەکەن

٣ ـ زینا وداوێن پیسی نەکەن

٤ ـ منالی خۆی زیندە بەچال نەکات

٥ ـ درۆنەکات

٦ ـ کەسێ چاکەی لەگەلی کرد بەخراپە وەلامی نەداتەوە.

ئەگەر ئەوانەیان گەیاندە جێ بەهەشت بەشیان دەبێت.

## هەڵسەنگاندن

١ هەر ڕستەیەک لەکۆمەڵی ( أ ) بگەینە بەرستەی کۆمەڵی ( ب ) لەمانەی خوارەوە:

| ( أ ) | ( ب ) |
|---|---|
| پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەیشت بەشەش پیاو لە | ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە ئێمەیان پێ دەترساند |
| پێغەمبەری خوا فەرمووی لەوەرزی حەج بۆ هۆزەکان | عەقەبە لەنزیک مینایە |
| ئەو شەش پیاوەکە زانیان موحەممەد پێغەمبەری خوایە ووتیان | ئایا کەسێک هەیە بم بات بۆلای هۆزەکەی |
| | هەتاکو پەیامی خوای پێ ڕادەگەینم |

٢ ئەو پیاوە کێ بوو کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) **ناردی** بۆ مەدینە وخەڵکی فێری ئایین بکات؟

نیشانەی(✔) بەرامبەر رستەی راست ونیشانەی(✖) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:

أ ـ پێغەمبەری خوا خۆی دەکرد بەنێو هۆزەکان وئەوانیش دەست بەجێ بڕوایان دەهێنا.

ب ـ پێغەمبەر بانگی پیاوانی خەزرەجی کرد وئیمانیان هێنا.

ج ـ لەمەرجەکانی بەیعەت وپەیمان ئەوەیە شەڕکردن لەپێناوی خوا.

د ـ ژمارەی موسلمانان کە پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا لەپەیمانی عەقەبەی یەکەم دوانزە پیاوبوون.

## پەیمانی عەقەبەی دووەم



موصعەبی كوری عومەیر تێ كۆشا بۆگەیاندن وبلاوكردنەوەی ئیسلام لەمەدینەدا لەگەل ئەوانەی بروایان هینابوو لەهۆزی خەزرەج دا وەچەندكەسانێ لەگەورەكانی ئەم دوو هۆزە گەیشتن بەكاروانی نورو رووناكی ئیسلام لەوانە سەعدی كوڕی رەبیع وعەبدولای كوڕی خەیسەمە ومونزیری كوری عەمر وسەعدی كوری عوبادە وە زۆری تریش لەوانەوە لەساڵی ئایندەش دا لەوەزری حەج دا موصعەب گەڕایەوە بۆشاری مەككە وەچەندها كەسیشی لەگەل دابوو لەوانەی موسلمان ببون لەهۆزی ئەوس

وخەزرەج دا وە لەگەل نوێنەری بێ بروا وموشریکان هاتنە مەککە وهەندێک ئافرەتیشیان لەگەل دابوون وەکە گەیشتنە مەککە گەیشتنە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ژمارییەکیان وەبڕیاریان داکە لە عەقەبە لەگەلی دابنیشن وە کە هۆزکانی تریش شەوێ نووستن ئەوان لەگەرمەی خەودابوون ئەوانیش بەپەنهانی لەسێ یەکی پاش نیوەشەو بەهێمنی رۆیشتن بۆشوێنی عەقەبە وکۆبونەوەیان لەگەل پێغەمبەر ئەنجام داو کە ژمارەیان حەفتا وسێ پیاو دوو ئافرەت بوون.

**گەیشتنی پیغەمبەر بەوان و ودرگرتنی پەیمان لییان :**

وەبەم نیوەشەوەپێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم)ومامی عەباس وئەبوبەکری راستگۆی لەگەل دابوو لەگەل عەلی کوری ئەبوطالیب (رەزای خوای لێ بێت) دیتیان وەخەلکانی مەدینە بەشەوق وزەقەوەچاوەنواری پیغەمبەری خوان لەپاشان عەبباس کەوتە قسە وفەرمووی: ئەی کۆمەلی خەزرەج ئێوە دەزانن موحەممەد لەناو ئێمە چ پلە وپایەیەکی هەیە وەسەربەرزە وبەهێزە لەلای ئێمە وە ئەوە خۆی حەز دەکات لەگەل ئێوە بێتە مەدینە وەئەگەر ئێوە دەتوانن ودەسەلاتتان هەیە کە بی پارێزن لەدەست دوژمنەکانی ئەوا با لەگەلتان دابێت وەئەگەر ئێوە ناتوانن

پارێزگاری بکەن ئەوە وازی لێ بێنن باله ناو گەلەکەی خۆی بێت یەکێکیان ووتی گوێم لێ بوو چیت ووت وەسوێند بەخوا خۆمانی لەسەر بەکوشتن دەدەین وماڵ ومنالی خومانی بەقوربان دەکەین. لەپاشان پێغەمبەری خوا قسەی کرد وقورئانی بەسەر داخوێندن وبانگی کردن بۆ ئیسلام وئیسلامی لاشیرین کردن وفەرمووی: ئایا بەیعەت وپەیمانم دەدەنێ کە بم پارێزن، وە لەم کاتە بەرائی کوڕی معرور دەستی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) گرت وفەرمووی: بەڵێ سوێند بەو خوایەی کە تۆی بەپێغەمبەر ڕەوانە کردوە وادەتپارێزین هەروەکو چۆن خێزان وماڵ ومناڵمان دەپارێزین پەیمانمان بدێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئێمە وەڵلا کوڕانی رۆژانی شەڕین وخاوەن چەکین وچەکدارین و ئەوە خوورەوشتە لەباب وباپیرانمان بۆمان بەجێ ماوە لەپاشان فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەستت ڕاکێشە ئەویش دەستی ڕاکێشا هەموویان بەیعەت وپەیمانیان دابە پێغەمبەر لەسەر بەگوێ کردن وگوێڕایەلی لەخۆش وناخۆشی لەئازادی ولەتوبزی وەلەگەل یەکتری دوبەرەکی ودوورەپەرێزنەبن.

**نەقیبەکان نامادەی پەیمان بوون**

لەپاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داوای لێ کردن لەناوخۆتان دا دوانزەکەس هەڵبژێرن بیکەن بەسەرۆک ونەقیبی هەرهەموو هۆزەکانتان، لەپاشان گەڕانەوە بۆلای کەل وپەلەکانی خۆیان ونووستن تابەیانی بێ ئەوەی ئەو کۆمەلەی کە لەگەلیان هاتبوون لەموشریکەکانی مەدینە پێ بزانن وەلەرۆژی دوایی موسلمانان لەخەو بەئاگا هاتن لەئەوس وخەزرەج دیتیان وا کۆمەلێ لەبێ بڕوایانی مەککە لەوانەش ئەبو جەهل بوو هاتنە نێو چادرەکانیان ووتیان ئەی گەلی خەزرەج ئێمە زانیمان وئاگاداربووین کەئێوە ئەم شەو گەیشتن بەپێغەمبەر وهاوڕابوون لەگەلی دا بۆشەڕکردن لەگەل ئێمە وەئێمەش حەزناکەین شەڕتان لەگەل بکەین وەچەند پیاوێ لەموشریکان بوون لەهۆزی ئەوس وخەزرەج بۆی هەلسانەوە ووتیان ئێمە پارێزگاری لەهۆزی خۆمان دەکەین ووەلامی ئەبو جەهلیان دایەوە سوێندیان خوارد کە ئەوەی تۆ باسی دەکەی هیچ بنەمایەکی نی یە وهیچ شتێ رووی نەداوە لەپاشان نوێنەرەکانی بڕیاری گەڕانەوەیان دا وموسلمانانیش گەڕانەوە بۆ مەدینە وچاوەرێی هاتنی پێغەمبەری خوابوون وەدینی خوایان بلاودەکردەوە لەشاری مەدینە.

ئایا دەزانی

مەرجەکانی بەیعەت وپەیمان:

١ ـ کە پێغەمبەری خوا بپارێزن هەروەکو خێزان ومال ومنالیان دەپارێزن.

٢ ـ لەسەریانە بەگوێ کردن وگوێڕایەلی لەخۆشی وناخۆشی ولەکاتی چالاکی وتەمەڵی دا.

٣ ـ لەسەر ئاینی ئیسلام نەبنە هۆی ئاشوب ولێک ترازان وجودایی.

## هەلسەنگاندن

١ بۆچی پێغەمبەر داوای لە ئەوس وخەزرەج کرد بۆ دانانی دوانزە سەروک ونەقیب؟

٢ لەسەر چ شتێک نوێنەری ئەوس وخەزرەج بەیعەتیان دا بەپێغەمبەر؟

٣ عەبباس چی بە نوێنەری ئەوس وخەزرەج ووت؟

٤ ئەم رستانەی خوارەوە بەووشەی گونجاو پربکەوە

ہ موسلمانان بەیعەتیان دابەپێغەمبەر لەمەککە لەشوێنێک کە پێی دەڵێن..........

ہ پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) گەیشتە نوێنەری ئەوس وخەزرەج وەمامی لەگەل بوو کە ناوی...........

وانەی بیست وپێنجەم

## کۆچی موسلمانان بۆ شاری مەدینەی منەوەرە



لەوکاتەی ئەنصاریەکانی مەدینە گەڕانەوە بۆشاری مەدینە هەوڵیان دائاینی ئیسلام لەشاری مەدینە بلاوبکەنەوە، بەلام پێغەمبەر وهاوەلانی لەشاری مەککە ئازار وئەشکەنجەیان زیادی کرد بەتایبەتی پاش ئەوەی زانیان کەلەگەل پیاوانی مەدینە لەئەوس وخەزرەج کۆبونەوە وموسلمان بوون وەپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)فەرمانی دا بەهەموو موسڵمانەکان کە کۆچ بکەن بۆ مەدینە وبگەن بەبراکانیان لەشاری مەدینە، وە لەم کاتەوە موسلمانان خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون بۆ کۆچ کردن وە بەنهێنی وبەدزی کۆمەل کۆمەل تاک تاک کۆچیان دەکرد بۆ شاری مەدینەی منەوەرە.

کۆچ کردنی ئەبی سەلەمە:

یەکەم کەسێ کۆچی کرد بۆ مەدینەی پیرۆز ئەبوسەلەمەی مەخزومی بوو مێردی ئوم سەلەمە وەلەگەڵ خێزانەکەی ومناڵە بچوکەکەیان لەگەڵ بوو کە خزم وکەس وکاریان دیتیان ئەبوسەلەمە وخانەوادەکەی کۆچ دەکەن هاتنەلای و پێیان ووت ئەگەر بەتەنیا کۆچ دەکەی ئێمە قەدەغەت ناکەین بەلام خێزانەکەت کچی ئێمەیە وناهێڵین لەگەڵ خۆت بیبەی بۆ بیابان و کۆچ بکات، وەمنالەکە وخێزانەکەیان لێ سەندەوە وەکۆمەڵێ لە کەس وکاری ئەبو سەلەمە پەلاماری مناڵە بچوکەکەیاندا ووتیان سوێند بەخوا ناهێڵین ئەو مناڵە لەلای دایکی بێت پاش ئەوەی جیاوازیتان کرد لەنێوان ژن ومێرد دا وەمناڵەکەیان لەباوەشی دایکی دەرهێنا وپاش ئەوەی کە مناڵەکە شانی دایکی توند گرتبوو.

وە ئەبو سەلەمە رێگای کۆچی بۆ شاری مەدینەگرتەبەر وبەتەنیایی کۆچی کرد، بەلام ئوم سەلەمەی خێزانی هەموو ڕۆژێک بەچاوی پڕ فرمێسکەوە دەردەچوو بۆ چواردەوری مەککە ولەوێ دادەنیشت وتێر دەگریا هەتا دەمەو ئێوارە لەپاشان دەگەڕایەوە وەبەردەوام بوو لەسەر ئەم کارەی تاکاتێکی زۆر هەتا ئەو کاتەی پیاوێ لەخزمەکانی بەلایا تێپەڕی ودڵی بۆی سووتا وقسەی لەگەڵ کەسو کارە نزیکەکانی کرد وەئەوانیش پاش ئەوەی مناڵەکەیان پێ داوە وئیزنیان دا بگات بەمێردەکەی کۆچ بکات لەپاشان بەسواری وشترێک لەگەڵ کاروانێک بەرەو مەدینە بەڕێیان کرد.

**کۆچ کردنی صوهیب:**

لەوکاتەی صوهەیب (رضی الله عنه ) ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە، کافرەکانی قوریش ڕێ یان پێ گرت و ووتیان تۆ کە هاتووی بۆ مەککە هەژار وفەقیر بووی وەئێستا لەمەککە دەوڵەمەند وزەنگین بووی وە دەتەوێ کۆچ بکەی بەم ماڵ وسامانە زۆرەوە سوێند بەخوا وانابێت ناهێڵین، صوهەیب فەرمووی: ئەگەر ماڵ وسامانەکە بەجێ بهێڵم بۆتان ڕێگام دەدەن کۆچ بکەم؟ ووتیان: بەڵێ، ئەویش ماڵ وسامانەکەی بۆیان بەجێهێشت وبەتەنیا کۆچی کرد بۆ مەدینەی پیرۆز، وە کەپێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەمەی زانی فەرمووی: (ربح البيع ابا يحيى) واتە: صوهەیب باوکی یەحیا قازانجی کرد لەم کڕین وفرۆشتنە ومامەڵەدا،

وە ئەمەبوو لە نمونەی ئەو هاوەڵانەی وەکو ئەو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کەخوای گەورە دەفەرمووێ:( وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ) البقره ٢٠٧

واتە: (هەندێ کەس خۆیان دەفرۆشن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی بەخوا، خوای گەورەش مییهرەبانە بەرامبەر ئەو جۆر بەندانە) تەفسیری ئاسان ل٣٢

کە عومەری کوڕی خەططاب وویستی کۆچ بکات، شیری کردە شانی وکەوانەکەی لەدەستی دابوو وە گۆچانەکەی هەلگرت وچووەلای کەعبەی پیرۆز وەحەوت جار تەوافی کرد لەپاشان چووە مەقامی ئیبراهیم (علیه السلام) دوورەکعەت نوێژی لەنزیک کردوچووەلای قورەیشیەکان کە لەپەنای کەعبە دانیشتبوون پێ یانی ووت ئای ئەم دەم وچاوانە چەندە خراپ وناشرینن یاخوا ئەم دەم وچاوانە سەرشۆڕبکات، وەکەسێ دەیەوێ لەدایکی بزر بێت وخێزانەکەی بێوەژن بێت ومنالی هەتیووبێت بالەپشت ئەم دۆڵە پێم بگات وەمن واکۆچ دەکەم بۆ مەدینە، وەگەورە گەورەی قورەیشیەکان لەوێ بوون کەس نەی وێرا وەلامی بداتەوە وەرۆیشت بۆ کۆچ کردن وەکەسێ نەی وێرا بەدوای بکەوێ، وەدووکەس بڕیاریان دابوو لەگەل عومەر کۆچ بکەن بەڵام یەکێکیان هات وئەوی تریان قورەیشیەکان بەندیان کرد ونەیان هێشت کۆچ بکات وە ئەم دووانە بەجوتە کۆچیان کرد وەلەڕێگادا چەندەها کەسی تریش هاتن ولەگەڵیا کۆچیان کرد تا گەیشتنە مەدینەی پیرۆز.

وەبەم جۆرە موسلمانان کۆمەڵ کۆمەڵ کۆچیان دەکرد بۆ مەدینە هەتاوای لێ هات شاری مەککە موسڵمانی تێدانەما تەنها بێ هێزان وژێردەستەکان نەبێت لەوانەی قورەیشیەکان بەندیان کردبون لەئافرەت ومنالان ونەخۆشان وپیر وبەساڵاچوان.

وەپێغەمبەری خوا وماڵ ومناڵی وئەبوبەکر وعەلی کوڕی ئەبو طالیب نەبێ کە مابوون لەمەککە موسلمانە کۆچکردووەکان ماڵ ومناڵیان و وولاتیان جێ هێشت وسامانیان کردە قوربانی دینەکەیان خوای گەورەش بۆی بژاردنەوە وتۆلەی بۆ کردنەوە بەچاکتر لەوان کەئەویش بەهۆی برایەتی ئیمانی ئەنصاری یەکانی خەلکی مەدینە وەئەوانیش چاوەرێی هاتنی پێغەمبەربوون وەخوای گەورە دەربارەی کۆچکەران وئەنصاریەکان ئەم ئایەتەی دابەزاندە خوارەوە کە دەفەرمووی:( وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ ) الحشر ٩

واتە: (ئەوانەی کەپێشتر ماڵ وشوێنی خۆیان ئامادەکرد بۆ پێشوازی لەکۆچکەران ودڵ ودەروونی خۆیان رازاندەوە بەئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردوە بۆلایان ولەدڵ ودەرونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسودی وبەخیلیەک نابێتەوە وحەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزلی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژار ونەداریشن، جائەوەی خۆی لەنەفس رەزیلی بپارێزێت وزال بێت بەسەریدا ئا ئەوانە هەرسەرفرازن) تەفسیری ئاسان ل٥٤٦

## هەڵسەنگاندن

١. هۆی چی بوو موسلمانەکانی هان دا کە کۆچ بکەن لەمەککە **بۆ** مەدینەی پیرۆز؟

٢. بۆچی کۆمەڵێ لەموسلمانەکان دواکەوتن لەکۆچ کردن بۆمەدینە؟

٣. هۆی چی بوو ئوم سەلەمە هەموو ڕۆژێک تا ئێ**وارە دەچوو** چوار دەوری مەککە؟

٤. ڕستەی کۆمەڵەی ( أ ) بگەیەنە بەڕستەی گونجاو **لەکۆمەڵی** (ب) لەمانەی خوارەوە

( أ )

| |
|---|
| موسلمانەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینە |
| صوهەیب مال وسامانی جێ هێشت بۆ بێ بڕواکان |
| عومەری کوڕی خەطاب کۆچی کرد |

( ب )

| |
|---|
| بۆ ڕزگاربوونی گیانی خۆی وکۆچبکات بۆ مەدینە |
| بەئاشکرا پاش ئەوەی تەوافی کرد |
| لەترسی قورەیشیەکان |

**خۆ ئامادەکردنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بۆ کۆچ کردن**

کە پێغەمبەری خوادلنیابوو لەگەیشتنی هاوەڵانی بەسەلامەتی بۆ مەدینەی پیروز تەنها کەسێ کەبەهانەی دروستی هەبووبێ داوای ئیزنی کۆچی لێ دەکرد ئەگینا کەس نەما کە کۆچ نەکات وە رۆژێکیان ئەبوبەکری راستگۆ هاتەلای پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم) داوای ئیزنی کۆچی لێ کرد تا بگات بە براکانی کۆچکردوەکان بەلام پێغەمبەری خوا مۆلەتی نەداو پێی فەرموو: پەلە مەکە لەوانەیە خوای گەورە هاوەڵێک ورەفیقێکت بۆ پەیدا بکات کەکۆچی لەگەڵ بکەی وەلەم کاتەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)ئامادەکاری دەکرد بۆ کۆچ وە ئەبوبەکری راستگۆ(رضی الله عنه ) دەیویست ببێ بەهاورێ ی لەم کۆچەدا وەهەروەها عەلی کوری ئەبوطالیبی ئامۆزای ئەویش دواکەوت بۆ ئەوەی لەجێگای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)بخەوێ لەشەوی کۆچکردنی دا بۆ ئەوەی کافرەکان وابزانن پێغەمبەر هێشتا ماوە وکۆچی نەکردووە وەبۆ دانەوەی ئەمانەتو سپاردەی خەڵکی کەلەلای دانرابوو، چونکە کافرەکانی قورەیش هەرچەندە دوژمنکاریان لەگەل دەکرد، لەبەرامبەردا مال وسامانیان لای دادەنا وسیقەو متمانەیان پێ هەبوو، وەبۆ ئەوەی بتوانێ کۆچ بکات بێ ئەوەی کەس بە دوایان بکەوێت، وەئەشکەوتی لەکێوی سەور ببێتە یەکەم

قۆناغی کۆچکردنیان بۆسەرلێشواندنی کافرەکانی مەککە چونکە کێوەکە دەکەوێتە باشوری مەککە وەرێگای مەدینەش دەکەوێتە باکوری مەککە.

**ئەبوبەکر پاش کۆچی کردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم):**

ئەبوبەکر دەورێکی باشی ببنی لەکۆچ کردنی پێغەمبەر وبەجێ گەیاندنی نەخشەی کۆچی پێەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەئەبوبەکر(رضي الله عنه ) دوو وشتری کڕی کەبەهێزبن بۆ سواری ورۆیشتن وەبەکورەکەی خۆی گووت کەناوی عەبدوللا بوو کەرۆژانە هەواڵی قورەیشیەکانی بۆبهێنێ ولەجولانەوەی ئاگاداریان بکات وەفەرمانی کرد بەئەسمائی کچی بەهێنانی خواردن بۆیان لەئەشکەوتی سەور فەرمانی کرد بەعامیری کوری فوهەیرە(رضي الله عنه ) کەمەڕەکانی ئەبو بەکر بهێنێ بۆبەردەم ئەشکەوتەکەو بۆئەوەی شوێنی پێیەکانی بزربێت وشیر وخۆراک بدات بەپێغەمبەر وئەبوبەکر وەهاودەنگ بوو لەگەڵ عەبدوللای کوڕی ئورەیقت کە ئەوەشارەزایی رێگای. مەدینە بوو کەلەگەڵ خۆیان دابێت بۆ گەیاندیان بۆشاری مەدینە کەئەمەش پاش سێ رۆژی تربێتەبەردەم ئەشکەوتەکە ڕێگای مەدینەیان پێ نیشان بدات، وە ئەمە ئەو نەخشە وپلانە بوو کەپێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) وئەبوبەکری راستگۆ دایان نا بۆ سەرگرتنی کۆچەکەیان بۆشاری مەدینەی پیرۆز چاوەرێ ی فەرمانی خوای دەکرد کەئیزن ومۆڵەتی بدات بۆ کۆچ کردن بۆ شاری مەدینەی پیرۆز.

پیلان گیرانی بی باوەڕان:

زۆربەی زۆری موسلمانەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینە تەنها ئەوانەی منداڵ وئافرەت وپیر وبەساڵاچوو بێ هێزان نەبێت کەسی ترنەما لە شاری مەککە، وەبەم هۆیەوە گەورەکانی قورەیشیەکان کۆبوونەوە لە (دارالندوە) کە شوێنی پیلان گێران بوو لە مەککە وەدیراسەی کاروباری موحەممەدی یان دەکرد بۆ ڕێگەگرتن لە کۆچکردنی وەنەگات بەهاوەڵانی هەتا نەبادا ڕۆژێک دابێت بەهێزبێت وپەلاماری مەککە بداتەوە وتۆڵەیان لێ بسێنێ

وەپاش راگۆڕینەوە دەربارەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری بەند کردنیاندا وەبەکۆت وزنجیر بیبەستنەوە خواردن وخواردنەوەی لێ قەدەغەبکەن تاکو دەمرێت ولەکۆڵیان دەبێتەوە، بەلام کۆمەلێکی تربەم رایە. رازی نەبون یەکێکی تریان ووتی با لەمەککە دەری بکەین تا بچێتە شوێنێکی دوور وئیسراحەت بکەین لەدەستی وەبەم رایەش رازی نەبوون ئەبوجەهل ووتی نا، من رایەکی ترم هەیە ئەوەیش ئەوەیە لەهەر هۆزێک گەنجێکی بەهێز دابنێت شیری پێ بدەین هەموویان بەیەک دەست بچین بۆ مالی موحەممەد ولێی بدەن وبیکوژن وەخوێنەکەی بلاودەبێتەوە لەسەر هەموو هۆزەکانی مەککە وکەس وکاریش ناتوانن شەڕ لەگەڵ هەموو هۆزەکان بکەن ئێمەش خوێنی ئەو ئەدەین بە بنەماڵەی عەبدولموتەلیب، وە هەموویان بەم رایە رازی بوون وەهەموویان گەرانەوە بۆ لای هۆزەکانی خۆیان بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پیلانە نەخشەگلاوەی خۆیان.

## هەڵسەنگاندن

① ئەمانەی خوارەوە ڕوون بکەرەوە

أ - ئەبوبەکری ڕاستگۆ ویستی کۆچ بکات داوای مۆڵەتی لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد ئەویش مۆڵەتی نەدا.

ب - ئەبوبەکری راستگۆ(رضى الله عنه ) فەرمانی کرد بەعامیری کوڕی فوهەیرە کە مەڕەکان بباتەلای دەرگای ئەشکەوتەکە لەکاتی بوونی ئەبوبەکر وپێغەمبەری خوا لەوێ دا.

② نیشانەی (✓) بەرامبەر ڕستەی ڕاست ونیشانەی (×) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە.

- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دواکەوت لەکۆچ کردن هەتا خوای گەورە ئیزنی دا.
- لەپیلانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بۆ کۆچ کردن ئەوە بوبچێ بۆ ئەشکەوتی حیراء .
- کاروباری عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر (رضى الله عنه ) لە کۆچ دا کەخواردن وخواردنەوەببات بۆ ئەشکەوتەکە لەکاتی شەودا.
- دەوری ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (رضى الله عنها) لە کۆچ داکە هەواڵی وجولانەوەی قوڕەیشی بگەیەنێت بەباوکی وپێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).
- عەلی کوڕی ئەبوطالیب نوست لەجێگای پێغەمبەر بۆ سەر لێ تێکدانی گەورە گەورەکانی قوڕەیش ودانەوەی شتی ئەمانەت بەخاوەنەکانیان.

○ گەورەگەورەکانی قورەیش بڕیاری قەدەغەکردنی پێغەمبەریان دا لەکۆچ کردن بەستنەوەی بەکۆت وزنجیری ئاسن.

٢ بازنە بکێشە بەدەوری وەلامی ڕاست لەمانەی خوارەوە

١ ـ بێ باوەڕەکان خانوێکیان هەبوو بۆ ڕاوێژکردن وپیلان گێڕان ناوی

○ داری ئەرقەم ○ دارونەدوە ○ داری ئەبوجەهل

٢ ـ ئەشکەوتی سەور دەکەوێتە

○ باشوری مەککە ○ باکوری مەککە ○ ڕۆژهەلاتی مەککە

## کۆچ کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وە ئەبوبەکری راستگۆ (رضی الله عنه)



رزگاربوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە پیلانی کوشتن

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەمەککە مایەوە پاش کۆچی هاوەڵانی چاوەنوارِی ئەوە بوو کەخوای گەورە مۆڵەتی بدات کەکۆچ بکات بۆ مەدینەی پیرۆز ئەوە بوو لەیەکێک لەوشەوانەی کەقورەیشیەکان برِیاریان دابوو کەهەڵسن بەکوشتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جوبرائیل (علیه السلام) هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێ ی فەرموو (ئەم شەو لەجێگای خۆت مەخەوە کەشەو داهات) ئەو گەنجانەی کەبرِیار

بوو هەڵسن بەکاری کوشتنی پێغەمبەر هاتنە بەردەرگای ماڵی پێغەمبەر وەهەر گەنجێک شیرێکی بەدەستەوە بوو چاوەنواری بوون کەبیکوژن کەپێغەمبەر ئەمەی بینی فەرمووی بەعەلی کوری ئەبو طالیب وەرە لەناونوینی من بخەوە وئەوعەبایەی منیش بەخۆت دابدە وە هیچ شتێ نایەتە رێگات کەپێت ناخۆش بێت، وەپێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) کە شەوێ بنوستبایە خۆی بەم عەبایە دەپێچایەوە، وە لەنێوانیان دەرچوو وە چەنگێک خۆڵی هەڵگرت وخستیەسەری هەریەکەیان، وخوای گەورە چاوی ئەوانی قەپات کردوونەیان دیت، وەئەم ئایەتەی دەخوێند کەخوای گەورەدەفەرموێ:( وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ فَهُمْ) یس ١٩ واتە: (بەربەستمان لەبەردەمیاندانـاوە وەلەپشتیانەوە داناوە پەردەشمان هێناوە بەسەر چاویاندا ئیتر ئەوانە حەق وراستی نابینن) تەفسیری ئاسان ل٤٤٠

پێغەمبەر وهاودڵەکەی لەئەشکەوت دا:

لەپاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)چووەماڵی ئەبوبەکر وپێ ی ڕاگەیاند کەخوا ئیزنی داوەکە کۆچ بکات وە ئەبوبەکریش داوای هاوڕێی ورەفیقاتی لێ کرد: فەرمووی بەلێ وەهەردووکیان لەدەرگای پشتەوەی ماڵی ئەبو بەکر (رضی الله عنه) هاتنە دەرەوە بەرەو ئەشکەوتی سەور بەرەو باشوری مەککە رۆشتن بەرێ گۆرینی بەرەو مەدینە، وەبێ بڕواکانیش ئەوە بوو یەکێک بەلای گەنجەکاندا لەبەردەم ماڵی پێغەمبەر تێ پەڕی پێ

یانی ووت چاوەرێ ی چی دەکەن، ووتیان چاوەرێ ی هاتنەدەری پێغەمبەر دەکەین ئەویش ووتی موحەممەد ئێستا بەبەردەمتان تێپەڕی کردو، ئەوانیش ووتیان سوێند بەخوا نەمان بینی وە دوای بینیان کەخۆلیان لەسەر سەری بوو وەچوونەژورەوەی جێگای نووستنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەبینی یان عەلی لەوێ بوو ووتیان کوا موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ئەویش ووتی نازانم، وە پێغەمبەر وئەبوبەکر بەسەلامەتی گەیشتنە ئەشکەوتەکە لەسەرتاوە ئەبوبەکر نەی هێشت پێغەمبەر بچێتە ناو ئەشکەوتەکە، بۆتەواو دلنیابوون کەچی هەیە لەناو ئەشکەوتەکە کەنەبادا شتێ هەبێت ئازاری پێغەمبەر بدات وەچوونە ژوورەوە دەرحال خوای گەورە فەرمانی بە جالجالوک داکە دەرگای ئەشکەوتەکە بچنێ بەتەونەکەی وەکافرەکانی قورەیش هەموو لایەکی مەککەیان نۆڕی وەبەخشیشێکی گەورەیان دانا بۆکەسێک کەهەواڵی موحەممەد وشوێنی ئەوبزانێ هەتا کافرەکان هاتنە بەردەرگای ئەشکەوت، ولەم کاتەدا ئەبوبەکر (رضی الله عنه) فەرمووی ئەی خۆشەویستی خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر هەرکەسێک تەماشای بەرپێ ی خۆی بکات دەمان بینێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: خەفەت مەخۆ ئەی ئەبوبەکر گومانت چی یە کە ئێمە دووکەسین وخوا سێ یەمینیانە، وەگوێ یان لەدەنگی‌و قسەی کافرەکان بوو بەلام خوای گەورە ئەوانی لەبەوچاوگوم کردو نەیان دۆزیەوە وەلەئێوارە

عەبدللای کوری ئەبوبەکر هاتەلای پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم)و ئەبوبەکر (رضی الله عنه) وەهەواڵی قورەیشیەکانی پێ راگەیاند وەلە بەرەبەیاندا گەڕایەوەمالی خۆی نەبادا کافرەکان پێ بزانن وەعامیری کوری فەهیرەش مێگەلە مەڕەکەی ئەبوبەکری هێنا بەردەرکی ئەشکەوت وشیری پێ دان وەتاشوێنی پێ ی ئەو دووهاوەڵە بەرێزە بزربێت وەرۆژی دواتر ئەسمائی کچی ئەبوبەکری ڕاستگۆ (رضی الله عنها) خواردنی بۆهێنان لەگەل ئاو، پەتێک نەبوو تورەکەی خۆراکی پێ ببەستێ هەلسا پێشتێنەکەی خۆی کردە دووکەرتەوە وتورەگەکەی پێ بەست وە لەبەرئەمەوە ناونرا (ذات النطاقین) واتە: خاوەن دووپشتێن

وەئەم نەخشەی کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دای رشت بە نهێنی بەڕێوە دەچوو رۆژانە عەبدوللا وئەسماء وشوانەکە دەهاتنە لایان وهەرکەسە بەکاری هەڵسا وەڕۆژی سێیەم عەبدوللای کوڕی ئەریقەت دوو وشتری هێنا بەردەم ئەشکەوتەکە وپاش ئەوەی داواکردنی موحەممەد لەلایەن قوڕەیشیەکان سووک بوو وەپێغەمبەر وهاوەڵەکەی ئەبوبەکری راستگۆ بەرەو باکور بەرێکەوتن هەتا گەیشتنە رێگای سەردەریای سوور (البحر الاحمر)

## هەڵسەنگاندن

١ بۆچی پێغەمبەری خوا دواکەوت لەکۆچ کردن؟

٢ ئەبوبەکر (رضی الله عنه) ترسا لەوکاتەی کە کافرەکانی بینی ولەبەردەرگای ئەشکەوت وەستاون پێغەمبەری خوا چی پێ ووت؟

٣ هەریەکێک لەوپیاوانە دەورێکی تایبەتی هەبوو لەنەخشەی کۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە دەوری ئەمانە دیاربکە

- عەبدوللای کوڕی ئەبوبەکری راستگۆ (رضی الله عنه).
- ئەسمائی کچی ئەبوبەکری راستگۆ (رضی الله عنها).
- عامیری کوڕی فەهیرە.
- عەبدوللای کوڕی ئەریقەت.

هەر رستەیەک لەکۆمەلەی ( أ ) بگەینە بەرستەی گو**نجاوی**
**کۆمەلەی ( ب )**

**( أ )**

لەوکاتەی خوای گەورە مۆلەتی پێغەمبەری دا بۆ کۆچ کردن

کافرەکان کۆبوونەوە لە داروالندوە

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد بەعەلی

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وئەبوبەکر هاتنەدەر لەمەککە

**( ب )**

کەلەناو عەباکەی ئەوبخەوێ

بۆ ئەشکەوتی سەور بۆ سەرلێشواندنی بێ بڕواکان

چووە مالی ئەبوبەکر

بۆئەوەی پیلان بگێرێ بۆ کوشتنی پێغەمبەر

## لەڕێگای کۆچدا



پیلان ونەخشەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەری گرت رزگاری بوو لەگەڵ هاوەڵەکەی لەدەست کافر وبێ بڕواکان هەتا گەیشتە شوێنێک دوور لەمەککەی پیرۆز لەسەر لێواری دەریای سوور، وەلەوکاتەدا بێ بڕواکان دانیشتبوون لەپەنای کەعبەدا پیاوێ هاتەلایان ووتی: من دووپیاوم بینی لەلێواری دەریادا دەرۆیشتن لەوانەیە موحەممەد وهاوەڵەکەی بووبن.



وهلەمکاتەداسوراقەیکوریمالیک
زانی بەڕاستی ئەمانە پێغەمبەر
وهاوهڵەکەی ئەبو بەکربوو
بەلام نەی وویست کەس بزانێ
بەس بۆشاردنەوەی ئەم هەواله
وە بۆئەوەی ئەوبەخشیشەی
کەدانرا بووبۆکوشتنی پێغەمبەر
ویستی بەدەست خۆی بخات
بۆیە ووتی نەخێر ئەو پیاوانە ووشتریان بزرببو دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی ووشترکەیان وەخۆی بەهێمنی چووەماڵەوە وە شیر وکەوانەکەی هەڵگرت وسواری ماینەکەی بوو بەدوایان کەوت وەکە نزیک کەوتەوە لەپێغەمبەرو هاوەڵەکەی هەرچوارپەلی ماینەکەی لەخۆل چەقی وسوراقەشی کەوتە خوارەوە لەسەر



ماینەکەی لەپاشان هەلساوە
ویستی پەلاماریان بدات
دیسان بۆجاری دووەم لێیان
نزیک کەوتەوە وهەتا گوێ ی
لەقورئان خوێندنی پێغەمبەر
بوو دیسان چوارپەلی
وولاخەکەی لەخۆل چەقی
وبەری دایەوە سەر زەوی

لەپاش ئەمەزانی کە پێغەمبەر، خوا پارێزراوی کردووە وە ئەویش داوای ئەمانی ودڵنەوای کرد پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەمینی کرد کە سەلامەت بێت بەشەرتێک هەواڵی ئەوان بەکەس نەڵێ وەسوراقەش ووتی: وادەکەم

وەپێغەمبەری خوا بەڵێنی ئەوەی پێدا کە رۆژێک دادێت کە تۆ بازنی دەستی کیسرای فارست لەدەست دەکرێ ئەگەر موسڵمان بی وەلەم دەمەی دا سوراقە موسڵمان بوو گەڕایەوە بۆ مەککە وەهەرکاتێ یەکێک ووتبای موحەممەدم لەشوێنێک دیوە ئەو سەری لێ تێک دەدان ونەی هێشت کەس پیان بزانێ ئەمە بوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)رێگای مەدینەیان گرتە بەرو لەژێر چاوەدێری خوا دابوون بەرەو مەدینەی پیرۆز

وەخوا پارێزراوی کردن لەهەموو خراپەیەک هەتا گەیشتن بەگوندێک پێ ی دەوترێت قوبا نزیک شاری مەدینە وەرزگاریان بوو لەدەست قورەیش، ونەخشەکەی سەری گرت و وەعەلی کوڕی ئەبوطالبیش ئەوئەمانەت وسپاردەی لا دانرابوو هەموو گەڕاندەوە بۆخاوەنەکانیان ئەویش گەیشت بەکاروانی کۆچکەران بەرەو مەدینەی منەوەرە کۆچی کرد

**هەوارنشینی ئوم مەعبەد:**

وەلەرێگادا گەیشتن بەهەواری ئوم مەعبەد لەرێگای کۆچیان بۆ مەدینەی منەوەرە وەدابەزین ولەوێ داوای خواردنیان کرد ئەویش بەهانەی هێنایەوە کەخۆیی ومێردەکەی هیچ خواردنێک شک نابەن وەپێغەمبەری خوا لەلایەکی خێمەکەچاوی بەمەرێکی لات وبێ هێز کەوت داوای لەئوم مەعبەد کرد کەئیزنم دەدەی بیدۆشم ئەویش ووتی: لەبەر بێهێزی نەی توانی لەگەل مەڕەکان بچێت بۆ لەوەرگا وشیری تیادا نی یە بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داوای مۆڵەتی کرد بیدۆشێ ئەویش مۆلەتی دا، پێغەمبەری خوا هەڵسا ناوی خوای لێ هێنا و(بسم الله)ی کرد



دەستی بەگوانی مەڕەکەدا هێنا بەفەرمانی خوا گوانی مەڕەکە پڕبوو لەشیر وەشیرەکەی دۆشی ودای بە ئافرەتەکە کە ئوم مەعبەد بوو وە پێغەمبەری خواش لەگەل ئەوانەی لەگەلی بوون شیریان خواردەوە وەپاشان مەڕەکەی دۆشی دووبارە تاجامەکە پڕبوو لەشیر ودۆشیەوە بۆ ئوم مەعبەد ومێردەکەی، کەمێردەکەی لەمال نەبوو وەکەمێردەکەی هاتەوە چاوی بەشیرکەوت پرسیاری لەژنەکەی کرد ئەم شیرەت لەکوێ هێنا؟ ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆگێرایەوە باسی پێغەمبەری کرد ئەویش فەرمووی: سوێند بەخوا ئەمە پێغەمبەری خوابوو لەپاشان خۆی وخێزانەکەی هاتنە مەدینە وموسلمان بوون.

## هەڵسەنگاندن

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەل ئەبوبەکری ڕاستگۆ رزگاری بوو لەدەست کافرەکانی قورەیش وەپیاوێ بەدوایان کەوت کەناوی سوراقەی کوڕی مالیک بوو

- أ - سوراقە چۆن زانی ئەمە موحەممەد وهاوەڵەکەی بوون بەرەو دەریای سوور چوون؟
- ب - سوراقە چی کرد لەوکاتەی گوێ ی لێ بوو باسی رۆیشتنی پێغەمبەریان کرد بەرەو دەریای سوور؟
- ج - ئەسپەکەی سوراقە چی بەسەر هات لەوکاتەی لە پێغەمبەر وهاوەڵەکەی نزیک کەوتەوە؟
- د - سوراقە داوای چی لەپێغەمبەر کرد لەوکاتەی ئەسپەکەی لەخۆل چەقی؟
- هـ - پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەلێنی چی دا ئەگەر موسلمان بێت وچی بکات کەداوای لێ کرد؟

چەماوە بکێشە بەدەوری وەلامی ڕاست لەمانەی خوارەوە

١ - پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داوای لەئوم مەعبەد کرد کەخواردنیان پێ بفرۆشێ

- ئەویش مەڕێکی پێ فرۆشتن
- نەیفرۆشت
- خواردنی سوکی دا پێیان

٢ - پێغەمبەری خوا مەڕێکی بینی لەخێمەکەدا وداوای مۆڵەتی دۆشینی کرد

- دەستی بەگوانی داهێنا بەلام نەی دۆشی.
- دەستی بەگوانی داهێنا وشیرێکی کەمی تیادابوو.
- دەستی بەگوانی داهێنا وشیرێکی زۆری تیادا هێنا.

٣ - ئوم مەعبەد ومێردەکەی هاتنەلای پێغەمبەر

- بۆئەوەی بیکوژن
- بۆ موسلمان بوون
- بۆ ئەوەی پارەی مەڕدۆشینی بدەنێ.

**چەند هەلویستیک لەنەرم ونیانی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەر خورەوشتێکی بەرز بوو وە لەدیارترین خورەوشتەکانی نەرم ونیان بوو وەنەرمی ئەوەبوو لەسەرەتای دەست کردنی بەگفت وگۆ لەگەل هەرکەسێک کە دەیدواند لەسەرخۆ بوو هەتا ئەگەر لەپێناویا تووشی ئازاریش بوایە لەدەست ئەو پیاوە، وە زۆر نمونەمان بینی لەم جۆرە لەوکەسانەی دەهاتن بۆئەوەی ئازاری بدەن وەلەدوایدا دەبوونە موسلمان بەهۆی نەرم ونیانی ئەو وە نمونەش لەنەرم ونیانی لەگەل هۆزەکەی:

یەکەم: لەو کاتەی گەلەکەی بەدرۆیان خستەوە ئەزیەتیان دا بەرەو طائیف رۆیشت تا بەئومێدی ئەوەی کەسێ بدۆزێتەوە یارمەتی بدات بانگەوازەکەی سەربخا و وەلامی بداتەوە، بەلام لەوێ تووشی لێدان ئازار وبەوەش نەوەستان بەمنالەکانیان بەرد بارانیان کردن هەتا پێیەکانی خوێناوی بوو وەناچاریان کرد بگەڕێتەوە بۆ شاری مەککەی پیرۆز وە لەڕێگادا گەیشت بەجوبرائیل (علیە السلام) وفریشتەی کێوەکان وە ئەوانیش فەرمانیان کرد فەرمان بکات تاخوای گەورە ئەو دوو کێوەی دەوری طائیف لێک بدات خوا لەناویان ببات وماڵەکانیان بەسەردا بڕوخێنێت بەلام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رازی نەبوو وەدوعا ونزای لەخوای

گەورە کرد کەخوا وابکات لە بنەچە ومناڵی ئەوان گەلی پەیدا ببێ کە خوا بپەرستن وپەیامی ئیسلام هەلگرن.
دووەمیان: بێ بڕواکان گاڵتەیان بەپێغەمبەری خوا دەکرد (صلی الله علیه وسلم) وە بەدرۆیان دەخستەوە وەپێغەمبەری خواش نەرمی دەنواند وەلامی نەدەدانەوە، ئەوە مامی ئەبو لەهەب بەدوای دەکەوت ئەو بانگی خەلکی دەکرد بۆ ئیسلام، ئەبولەهەبیش دەی ووت بڕوای پێ مەکەن درۆزنە وەهەروەها خێزانیشی ئوم جەمیل جوێنی بەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەدا دڕک ودار وزبلی دەخستە سەر ڕێگای پێغەمبەر وپێش دەرگای ماڵیان وە پێغەمبەری خوا قەت بەرامبەریان خراپەی نەدەنواند بەڵکو نەرم ونیان بوو.
سێیەم: لەڕوداوی شەوڕەوی وبلند بونەوە(الاسراء والمعراج) گەلەکەی بەدرۆیان خستەوە وگاڵتەیان پێ دەکردو وەویستیان موسڵمانە تازە موسلمان بووەکان تووشی فیتنەبکەن لە دینەکەیان وەپێغەمبەری خواش بەنەرمی وەلامی دەدانەوە.
چوارەم: کافرەکانی قوڕەیش هەوڵیان دا ڕێگری بکەن لەبانگەوازەکەی، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەهەموو هۆیەکەوە

جارێک بەئازار وئەشکەنجەدان بەلاشە، وەجارێک بە ئابلۆقە ودەنگ دابڕین لەئابوری. وەهەندێ جاریش بەئازاردانی هاوەلانی وەکو بیلال وخانەوادەکەی یاسر، ئەوانە هەمووی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەنەرم ونیانی ودانایی وحیکمەتەوە رەفتاری لەگەل دەکردن.

کەس لەو نەرم ونیانتر نەبوو وەکەسیش لەو زیاتر ئارامی نەدەگرت لەسەر ئازار ونارەحەتی ئەو فێرمان دەکات بەخوڕەوشتی نەرم ونیانی وئارامگری بۆ ئەوەی بانگەوازی ئیسلام سەرکەوتوبێ بلاوبێتەوە لەنێوان خەڵکی دا.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەرم ونیان بوو لەگەل گەلەکەی وهەموو خەلکی روداوێک باس بکە لەسەر نەرمی لەگەڵ گەلەکەی؟

نیشانەی (✔) بەرامبەر وەلامی راست ونیشانەی (✖) **چەوت** بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ

أ - پێغەمبەری خوا بانگی خەلکی تائیفی کرد بۆ ئیسلام وئەوانیش بەدەم بانگەوازەکەی هاتن وموسلمان بوو.

ب - فریشتەی کێوەکان وجوبرائیل هاتنەلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی کێوەکانی تائیف بدەن لەیەک ولەناویان ببەن بەلام پێغەمبەر رازی نەبوو.

ج - ئەبو لەهەب پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بەدرۆ خستەوە وەپێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بەنەرمی وەلامی دەدایەوە وەکو ئەو نەبوو.

وانەی سێیەم

**دامەزراوی لەبڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام (الثبات)**



مامۆستا بەقوتابییەکانی ووت: ئەمرۆ باسی دامەزراوی پێغەمبەر دەکەین ئەی کورەکانم لەگەیاندنی بانگەوازی ئیسلام وەچەندەها ڕووداو هەڵوێستێک ڕووی دا لەژیانی ئەو کەڵەپیاوە ئەمە ڕوون دەکاتەوە کەسێ لەئێوە دەتوانی هەلویستەک یان ڕووداوێک باس بکات

یەک لەقوتابیەکان داوای مۆلەتی کرد ووتی: ئەی مامۆستا گیان باسی روداویک دەکەم کەمامی ئەبوطالیب رۆژێک لەرۆژان بانگی موحەممەدی کرد وپێ راگەیاند کە پاشەکشە بکات لەو بانگەوازەی کەدەیکات بەرامبەر پێدانی مال وسامانێک لەلایەن بێ بروایانی قورەیش، یان جوانترین ئافرەتی لێ مارە بکەن، یان بیکەن بەسەرۆک وگەورەی هەمووان وەپێغەمبەری خواش رەتی کردەوە ئەوپێشنیارەی ئەوان، وفەرمووی سوێندم بەخوا ئەی مامەم ئەگەر خۆر بێتەلای راستم ومانگیش بێتەلای چەپم لەسەر ئەوەی کەواز لەم پەیامی ئیسلام بێنم وازناهێنم تایان سەردەکەوم یان لەپێناویا سەردەنێمەوە

مامۆستا: ئەوە بەلگەی روون وئاشکرایە لەسەر دامەزراوی پێغەمبەر لەسەر بانگەوازکەی وە ئەوە نەبەپارە دەی گۆری وەنەرێک کەوتنی لەسەردەکات، لەپاشان مامۆستا ووتی: کێ دەتوانی باسی رووداوێکی تربکات ئەی کورەکانم

قوتابیەکی تر داوای مۆلەتی کرد لەوەلامدا ووتی: بێ برواکان ئابلوقەی پێغەمبەریان دا وەئەوانەی لەگەلی بوون تا سێ سال هەتا وایان لێ هات لەجیاتی خواردن گەلای داریان دەخواد وەمنالەکانیان لەبەر برسیەتی دەگریان بەلام بەقەد تۆزقالێک پاشەکشەیان نەکرد لەدینەکەیانو بانگەوازەکەیان بۆ قورەیش وهەتا خوای گەورە دەرووی خێری لێ کردنەوە وئابلوقەکە کۆتایی هات.

لەپاشان قوتابیەکی تر هەڵسایەوە داوای مۆلەتی کردو ووتی: بێ بڕواکان هەوڵیان دا ئەزیەت وئازاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بدەن بەدانان وخستنە سەر سەری لاکی ئاژەل وپیسای وخوێنی لەسەر پشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەیەکێکیان هەولی خنکاندنی دا وەئەبوبەکر بۆی هەڵسا وبەرگری لێ کرد ولەپێغەمبەری خوای دوورخستەوە وە ووتی ئایا پیاوێ دەکوژن کەدەلێ (ألله) پەروەردگارمە، بەلام لەگەل ئەوەشدا خۆی نەدا بەدەستەوە دڵ قایم بوو وەدامەزراو بوو لەسەر ئەو پەیامەی کەهێنابووی بێ گوێ دانە ئەوکارانەی دوژمنان دەیان کرد ئارام گربوو لەسەر ئازاری ئەوان

مامۆستا: ئەی کورەکانم پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)تووشی ئەزیەت ونارەحەتی بوو لەلایەن گەورەکانی قورەیشیەکانەوە بەلام نەپەشیمان بوو وە نەسارد بۆوە لەو پەیامەی خوا بۆی رەوانەکردبوو وە دل دامەزراوی ئەویش هۆیەک بوو بۆ سەرکەوتنی خوا ودامەزرانی دەولەتی ئیسلام لە شاری مەدینەی منەوەرە، خوای گەورە دەفەرمووێ:(........إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ ) یوسف ٩٠

واتە: کەسێ خۆپارێزی بکات وئارام بگرێ ئەوا خوای گەورە پاداشتی چاکە کاران بەزایەنادات.

## هەڵسەنگاندن

١) لەڕەوشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دامەزراوی بوو لە ڕاگەیاندنی بانگەوازی ئیسلام. باسی روداوێک بکە کە بەلگە بێت لەسەر ئەم ڕەوشتە؟

٢) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چی بەمامی ئەبوو طالیب ووت لەوکاتەی کە قورەیشیەکان هاتنەلای مال وسامان وئافرەت وسەرۆکایەتیان لەپێش دانا؟

هەر رستەیەک لەکۆمەلەی أ بگەینە بە رستەی گونجاوی کۆمەلی ب لەمانەی خوارەوە

( أ )

بێ بڕواکان ئابلۆقەی پێغەمبەر وموسلمانانیان دا

ماوەی ئابلۆقەی ئابوری لەسەر پێغەمبەر وهاوەلان

بێ بڕوایان هەولیان دا پێغەمبەر بخنکێنن

( ب )

ئەبوبەکر بەرگری لێ کرد

لەدۆلی ئەبوو طالیب

سێ سال

لێ بوومەوە بەئومێدی خوا لەبەرواری ٨ی رەجەبی سال ١٤٣٤ کۆچی
بەرامبەر بە ١٨ی ئایاری سالی ٢٠١٣ی زاینی
لەخوا داواکارم ئەم وەرگێرانەم وەرگرێ ولەکردەوە چاکەکانم
تۆماری بکات وشەرمەزاری بازاری قیامەت نەبین وەببێتە زەخیرە
وزاد لەگەڵم بێت کاتی شۆرِم دەکەنەوە ناوگۆرِ
وەبۆئەوەی موسلمانانی کورد زمانم سودی لێ وەرگرن
وە زۆر سوپاسی کاک عبدالحکیم دەکەم کە بەهەموو شێوەیەک
یارمەتی دام لەپێدانی سەرچاوە
بۆ سەرکەوتنی ئەم بەرهەمە پیرۆزە وەلەخوا داواکارم لەمنیش
ولەویش خۆش بێ بمانخاتە نێوو رەحمەتی خۆی
امین والحمد لله رب العالمین

**انور قادر شێخانی**
**هەولێر**
**٢٠١٣/٥/١٨زپێش نوێژی عیشا**